بۆ مێردمنداڵان

ئەسترید لیندگرین

# ئێمەین منداڵانی دێ بچکۆل
# ئاوایی گرمە گرم







وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

ئەم کتێبە لەسەر بودجەی پایتەختی ڕۆشنبیریی چاپ کراوە

ناوی کتێب: ئێمەین منداڵانی دێ بچکۆل، ئاوایی گرمەگرم
بابەت: رۆمان
نوسینی: ئەستريد ليندگرين
گۆڕینی لە سویدییەوە: حەمە دۆستان
پیتچنین: حەمە دۆستان
پێداچوونەوە و هەڵەچنی: دلێر محەممەد
نەخشەسازی بەرگ و ناوەوە: هەلاڵە عەزیز
سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵڵا
چاپخانە: کەمال
تیراژ: ( ١٠٠٠) دانە
نرخ: (٢٠٠٠) دینار
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٨٦٤)ی ساڵی ( ٢٠١٧)ی پێدراوە
ناونیشان: سلێمانی/ شەقامی سالم- پشت کتێبخانەی گشتی
☎ : ٣٣٠١٩٤٩

### ناوەرۆک


• پێشەکی ٧
• ئێمەین منداڵانی دێ بچکۆل ٩
• برا هاروهاجەکانم ١٢
• خۆشترین کاتم ڕۆژی لەدایکبوونم بوو ١٨
• ئاهەنگ بەردەوامە ٢٤
• پشووی هاوین هات ٣٠
• شێلم هەڵکەندن و دەستکەوت، پشیلەیەک ٣٧
• هەستیار بوو بە خاوەنی سەگی خۆی ٤٦
• باپیرەیەکی میهرەبان ٥٣
لە هەموو شتێکی تر خۆشترە
• کوڕان ناتوانن نهێنی خۆیان بپارێزن ٦٣
• ئەمشەو لەکایەنەکەدا دەنوین ٧٢
• من و هاوبەش نیازمان بوو ڕابکەین ٧٩
• ماڵە باجێنە ٨٧
• کوڕ ناتوانێت نهێنی بپاریزێت ٩١
• دەوامی قوتابخانە دەستی پێکردەوە ٩٨
• کاتێک ئێمە خۆمان گۆڕی ١٠٤
• ئاو و هەوای ناخۆش ١٠٩
• بەم زوانە دەبێت بە جەژن ١١٥
• ژیاننامە ١٢٢

## پێشەکی

منداڵە خۆشەویستەکان!

بەسەرهاتی ئەم ڕۆمانە سەبارەت بە ژیانی منداڵی نوسەری سویدی و ناوداری جیهانی (ئەسترید لیندگرین) خۆیەتی.

من هەوڵمداوە بە جۆرێکی سادە و ئاسان، ئەم شاکارە جوانەتان بۆ بکەم بە کوردی وەکو ئەوەی ئەسترید لیندگرین خۆی نووسەرێکی کورد بوو بێت و بە زمانی شیرینی کوردی بۆ ئێوەی خۆشەویستی نووسیبێت.

بەجۆرێک ڕووداوەکانم دارِشتووەتەوە، کەمنداڵانی کورد خۆیانی تێدادەبیننەوە و وادەزانن خۆیان پاڵەوانی ڕۆمانەکەن.

بەسەرهاتەکانیش تا بڵێی سەرنجڕاکێشن و لە جیهانی دەروونی و فەنتازی منداڵانەوە نزیکن.

بە ئەوپەڕی پێزانینەوە سوپاسی دوکتۆر هاوناز وشیار دەکەم کە بە نووسینەکەدا چۆتەوە و هەڵە و کەموکووڕییەکانی چاک کردووە.

هیوادارم {ئێمەین منداڵانی دێ بچکۆل_ ئاوایی گرمەگرم، چەند بەسەرهاتێکی دیکەی منداڵانی ئاوایی گرمە گرم، هەر شادییە لە دێ بچکۆل} بە دڵی ئێوەی ئازیز بێت.

حەمە دۆستان

# ئێمەین مندالانی دێ بچکۆل



من ناوم سارایە. هەر بە ناوەکەمدا بۆتان دەردەکەوێت من کچم. تەمەنم حەوت ساڵە و زۆرم نەماوە ببم بە هەشت ساڵ.

بە لامەوە سەیرە هەندیکجار دایکم بانگم دەکات و پێم دەڵێت: "کچە گەورەی ماڵەکەم من قاپەکان دەشۆم و تۆش بۆم وشک بکەرەوە." کەچی براکانم پێم دەڵین: "لاچۆ تۆ بچکۆلانەیت نامانەوێت یاریمان لەگەڵدا بکەیت."

ئێستا من سەرم سوڕماوە . نازانم من گەورەم یان بچکۆلانەم. براکانم پێم دەڵێن من کچێکی بچکۆلانەم، دایکشم بانگم دەکات کچە گە ورەکەم. بەڵام من وابزانم نە گەورەم و نە بچکۆلانەم، مندالێکی مامناوندیم.

شڤان و شاد برامن. شڤان نۆ، شادیش هەشت ساڵانە. شڤان خێرایە لە ڕاکردندا. ئەو پێشی من دەداتەوە، بەڵام من پێشی شادی برام دەدەمەوە. کاتێک کە پێشبرکێ دەکەین، شاد و شڤان فێڵم لێدەکەن. شڤان دەمگرێت بۆ ئەوەی شاد پێشم بداتەوە. بە داخەوە من هەر برام هەیە و ئەوانیش تا بڵێی هاروهاجن.

ئاوایییەکەمان ناوی دێ بچکۆلە، چونکە لە سێ خێزان پێکهاتووە. ماڵەکەی ئێمە ناوی خانووی ناوەڕاستە چونکە کەوتۆتە ناوەڕاستی هەر دوو خانووەکەی ترەوە. هەر سێ خانووەکە لە ڕیزی یەکتریدا دروستکراون. خانوویەکیان لە لای باکوور و ئەویتریان لە لای باشووری ئێمەوەیە. هەر وەکو ئەم وێنەیەی لای خوارەوە.



لێمببورن، من نازانم بە جوانی وێنەی لادێکەمان بکێشم. چونکە من لە وێنەکێشاندا زۆر باش نیم.

یەکێک لە دراوسێکانمان کوڕێکیان هەیە ناوی هەستیارە.

هەستیار تاقانەیە. ئەو هەمیشە لەگەڵ شڤان و شادی برامدا یاری دەکات. هەستیار تەمەنی هەشت ساڵە و ئەویش وەک شڤانی برام خێرایە لە ڕاکردندا.

دراوسێکەی ترمان دوو کچیان هەیە. "دووان!" ئەی خودای گەورە

من چیم بکردایه ئەگەر ئەوانیش کوڕ بوونایە. بە ڕاستی بەختێکی باشم هەیە کە ئەوانیش کوڕ دەرنەچوون.

یەکێک لە کچەکان ناوی هانایە. ئەویتریان ناوی هاوبەشە. هانا تەمەنی نۆ ساڵە و هاوبەشیش هاوتەمەنی خۆمە. خودا دەیزانێت تا ڕادەیەک، هەردووکیانم وەک یەک خۆشدەوێت، هەرچەندە لە ڕاستیدا وابزانم تۆزێک هاوبەشم زیاتر خۆشدەوێت.

سێ خێزان و شەش منداڵ لە ئاواییەکەماندا دەژین.

منداڵەکانیش: من و شڤان و شاد و هەستیار و هانا و هاوبەشین.



# برا هار و هاجەکانم

جاران لـە ژووری تەنیشـت هەورەبانەکەماندا لەگەڵ بـراکانمدا دەنووستم. ئێستا خاوەنی ژووری تایبەتی خۆمم. ئەو ژوورەی کە کاتی خۆی نەنکمی تێدا دەژیا. ئێستا نا، دوایی باسی ژوورەکەمتان بۆ دەکەم.

ئەو کاتەی کە لەژووری براکانم دەنووستم، شەوانە بەسەرهاتی خێو و جنۆکەمان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە. گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانە ترسناکبوون، لە هەمانکاتیشدا خۆش و سەرنج ڕاکێش بوون.

شڤان بەسەرهاتی واترسناکی لابوو کـە خەوی لێدەزڕاندم و تا درەنگ خەوم لێنەدەکەوتەوە.

شادی برام تاقەتی گێڕانەوەی چیرۆکی خێو و جنۆکەی نەبوو. ئەو هەمیشە ئەوەی دەوت، کە گەورە بوو، دەڕوات بۆ ئەمەریکا. لەوێ دەبێت بە کوێخای یەکێک لە خێڵە هیندییەکان.

شەوێکیان شڤان بەسەرهاتێکی ترسناکی گێڕایەوە، چۆن خێوێک بە شەو بەماڵێکدا گەڕاوە و جێگۆڕکێی بە قەنەفە و کورسی ماڵەکە کردووە. شەوەکەی تابڵێی تاریکبوو. ئەوەندەمزانی لەپڕ کورسیی ناو ژوورەکەمان کەوتە جێگۆڕکێ. هەر تاوێ بە لایەکدا دەکەوت. من زۆر ترسام. لە ترساندا دڵم خەریکبوو دەوەستا. چونکە من



دڵنیابووم جنۆکە هاتۆتە سەرمان. لە ترساندا، تا توانام بوو قیژاندم. لەهەمانکاتدا شڤان و شاد دەستیانکرد بە قاقای پێکەنین. ئیتر زانیم کە جنۆکە نەهاتۆتە سەرمان. لە سەرەتادا من زۆر تووڕە بووم. بەڵام زۆری پێنەچوو، منیش خۆم پێڕانەگیرا و لەگەڵ براکانمدا دامە قاقای پێکەنین.

تۆ سەیربکە، ئەم برا فێڵبازانەی من پەتیان بەستبوو بە کورسییەکانەوە و لەسەر جێگەکەیانەوە پەتەکەیان ڕاکیشاوە و کورسییەکانیش بەوجۆرە کەوتوونەتە جێگۆڕکێکردن. لە منیش وابوو جنۆکە هاتۆتە ناو ژوورەکەمان.

جاران کە لە ژوورەکەی شڤان و شاددا دەنووستم. هەر لەبەرئەوەی من لەوان بچووکتر بووم بۆمنەبوو بە خواستی خۆم هیچ بکەم. شەوانە کەی شڤان حەزیبکردایە هەر لە سەر جێگەکەی گڵۆپی ژوورەکەی دەکوژاندەوە.

کاتی واهەبوو من دەمویست کتێب بخوێنمەوە کەچی شڤان بەسەرهاتی جنۆکەی دەگێڕایەوە. جاری وا هەبوو من خەومدەهات و دەمویست بنووم کەچی براکانم ئەو کاتە خەریکی گرمەگرم و شەڕەشەق بوون.

شڤان لە سەر قەرەوێڵەکەی پاڵدەکەوت و کەی ئارەزووی لێبوایە گڵۆپی ژوورەکەی دەکوژاندەوە. بە کاغەزێک سویچی گڵۆپەکەی داپۆشیبوو هەروەها پەتێکیشی بەستبوو بە دوگمەی سوویچەکەوە. ئەو هەر لەسەر قەرەوێڵەکەیەوە دەیتوانی گڵۆپەکە داگیرسینێت و بیکوژێنێتەوە. ئەم داهێنانەی شڤان داهێنانێکی ئاڵۆزبوو. من منداڵم ناتوانم بە باشی باسیبکەم بۆتان. تەنها ئەندازیارێکی زیرەک دەتوانێت بە دروستی باسی ئەم داهێنانە بکات. خۆ من ئەو ئەندازیارە لێهاتووە نیم. شڤانی برام دەیەوێت ببێت بە ئەندازیار، بەلای ئەوەوە کارێکی گرنکە سویچی گڵۆپ بە کاغەز دابپۆشێت.

جاران شاد دەیویست ببێت بە کوێخای خێڵێکی هیندی. کەچی ئێستا ڕای گۆڕیوە و دەیەوێت ببێت بە شۆفێری شەمەندەفەر. بەڵام من ئێستا نازانم کە گەورەبووم دەمەوێت ببم بەچی.

لەوانەیە حەزبکەم ببم بە دایک. چونکە من منداڵی ساوام زۆر خۆشدەوێت. من حەوت بوکەشووشەم هەیە کە خۆم کردووە بە دایکیان.

جوانترین بوکەشووشەم ناوی ڕەزێ یە. قژی لوولە و چاوی شینە و سپیکەلانەیە. ئەو لەناو بێشکە بچکۆلانەکەی خۆی دەنوێت و بەتانییەکی پەمەیی بەسەردا دەدەم. ئەو بەتانییەی کـە کاتی خۆی دایکم بۆی چنیبووم.



جارێکیان ویستم ڕەزێ لە بێشکەکەی دەربهێنم کەچی برا فێڵبازەکانم بەپارچە خەڵووزێک سمێڵیان بۆ درووست کردبوو.

چەند ساڵێکیتر گەورە دەبم. ئیتر بۆم نییە لەگەڵ بوکەشووشەکانمدا یاری بکەم. ئای کە ناخۆشە زوو گەورە ببیت. دەزانن ئێستا بۆ من زۆر دڵم خۆشە. چونکە لەگەڵ براکانم لە هەمان ژووردا نانووم.

هەرسێ خانووەکەی لادێکەمان چوون بەناویەکدا. باوکم دەڵێت نەدەبوایە خانووەکان ئەوەندە لە نزیکی یەکترییەوە دروستبکرانایە. لە پەنجەرەی ژووری شڤان و شادەوە ژوورەکەی هەستیار بەجوانی دیارە. لە پەنجەرەی ژوورەکەی منیشەوە ژوورەکەی هانا و هاوبەشم بە باشی لێدیارە.

باوکم دەڵێت: ئـەو وەسـتایانەی کاتی خـۆی ئەم خانووانەیـان دروستکردووە، دەبوایە لە نزیکی یەکترییەوە بەو جۆرە دروستیان

نەکردنایە. بەڵام ڕای کوڕەکان بە پێچەوانەوە بوو. بەلای ئەوانەوە خۆشییەکە لەوەدایە کە خانووەکان لە نزیکی یەکترییەوە دروستکراون. شۆڕەبییەکی گەورە لە ناوەڕاستی حەوشەکەی نێوان ماڵی ئێمە و هەستیاردا هەبوو. لقوپۆپی شۆڕەبییەکە گەیشتبووە بەر پەنجەرەی ژووری هەستیار هەروەها ژووری شڤان و شاد.



لە جیاتی ئەوەی کوڕەکان بە پێپلیکانەکاندا بڕۆنە خوارەوە و بچنە دەرەوە بۆ ماڵەکەیتر و لەوێشەوە جارێکیتر سەر لە نوێ بە پێپلیکاندا سەرکەونەوە.

ئەمان لـە پەنجەرەی ژوورەکانیـانەوە یەکسەر دەچـوونە سەر شۆڕەبییەکە و لەوێوە دەچوون بـۆ سەردانی یەکتری. ئەم ڕێگایە هەم خۆشتر و هەم خێراتر و ئاسانتر بوو.

جارێکیان باوکم و باوکی هەستیار بڕیاریاندا شوڕەبییەکە ببڕنەوە. چونکە بەلای ئەوانەوە سێبەری شوڕەبییەکە هەردوو خانووەکەی مراندبوو. شڤان و شاد و هەستیار ئەوەندە پاڕانەوە ئیتر باوکەکان ناچاربوون پەشیمان ببنەوە.

دەزانن تا ڕۆژی ئەمڕۆ ئەم شۆڕەبییە هەر لە جێگەی خۆی ماوە.

# خۆشترین کاتم ڕۆژی لەدایکبوونم بوو

بەلای منەوە خۆشترین ڕۆژانی ژیانم جەژنی لەدایکبوون و جەژنی ڕەمەزان و قوربانە. خۆشترین یادی جەژنی لەدایکبوونیشم ئەو جارە بوو، کە حەوت ساڵم پڕکردەوە.

بەیانی زوو لەخەو هەستام ئەو کاتە لە ژوورەکەی شڤان و شاد دەنووستم. کە من بەئاگا هاتمەوە شڤان و شاد لە شیرین خەودابوون.

قەرەوێڵەکەم خۆی لە خۆیدا جیرەی دەهات. منیش بە هەلمزانی زیاتر جیرەی لێبهێنم بۆئەوەی براکانم خەبەر بکەمەوە. بە ئەنقەست تەپاوتلم دەدا لەسەر قەرەوێڵەکە، کەچی بۆ نەگبەتی من نەمتوانی کەسیان خەبەر بکەمەوە.

من لە یادی ڕۆژی لەدایکبوونمدا نەدەکرا خۆم واپیشانبدەم کە بەخەبەرم. چونکە وا باوە ماڵەوەمان دەبێت خەبەرم بکەنەوە. کەچی بۆ نەگبەتی من، هەموویان لە شیرین خەودا بوون.

منیش هەر تەپاوتلم دەدا تا شادم خەبەرکردەوە. ئەویش کە خەبەری بووەوە بە ئەسپایی شڤانی خەبەرکردەوە.

هەردووکیان لەسەرخۆ و بێدەنگ بە پێپلیکانەکاندا چوونە خوارەوە. پاش تۆزێک گوێم لە دەنگی خرەخرِی دانانی قاپوو قاجاخ بوو. بڕوام پێبکەن لە بێسرەوتیدا نەمدەتوانی لە جێگەکەمدا خۆم ڕابگرم.

زۆری پێنەچوو لە پێپلیکانەکانەوە گوێم لە دەنگی تەپەی پێ بوو. منش تا توانیم چاوی خۆم نوقاند و جولەم لە خۆم بڕی.

لەپڕ تەق دەرگا کرایەوە و باوکم و دایکم و شڤان و شاد و باجی توبا کـە لە ماڵمان ئیشی دەکـرد. بە گۆرانی "هەموو ساڵێک بە خۆشی" خۆیانکرد بە ژووردا. دایکم سینییەکی بە دەستەوە بوو. کوپێک کاکاو و گوڵـدانێکی پڕ گوڵ و هەروەها کێکێکیشـی لە سەربوو کـە پێشتر باجی توبا درووستیکردبوو. لـە سەر کێکەکە نووسرابوو "سارا حەوت ساڵ پڕدەکاتەوە" سەرم سووڕما ئەوان هیچ دیارییەکیان لەگەڵ خۆیاندا پێنەبوو. لەپڕ باوکم پێی وتم:

"کچە جوانەکەم شەربەتەکەت بخۆرەوە دواتر بزانین دیارییەکت بۆ پەیدا ناکەین."



بەپەلە شەربەتەکەم خواردەوە. خۆم دەمزانی کە شتێکی کوتوپڕ لە ئارادایە، بەس نەمدەزانی چییە. دایکم بە خاولییەک چاوی بەستم. باوکیشم هەڵیگرتم و بردمی بۆ لایەک نەمدەزانی کوێیە. گوێم لە فڕکە و ڕاکردنی شڤان و شاد بوو لە تەنیشتمەوە کردبوویان بە هەرا و جاروباریش نوقورچیان لێدەگرتم و هاواریان دەکرد:

"سارا، دەزانی ئێستا لەکوێیت؟"

باوکم منی بە باوەشەوە گرتبوو. بە پێپلیکانەکاندا دەچووە خوارەوە و سەردەکەوتە سەرەوە و دەستیدەکردەوە بە ڕۆیشتن. لە من وابوو بردومیانەتە دەری دەرەوە. کەچی کاتێک دایکم خاولییەکەی لابرد لە سەر چاوم. لە ژوورێکدا چاوم کردەوە کە پێشتر نەمبینیبوو. یاخود بەلای کەمەوە وامدەزانی کە پێشتر نەمبینووە.

کاتێک لە پەنجەرەکەوە ڕوانیم بۆ دەرەوە ژوورەکەی هانا و هاوبەشم لێوە دیاربوو. ئەوان لە پەنجەرەی ژوورەکەیانەوە دەستیان ڕادەوەشاند و پیرۆزبایی جەژنی لەدایکبوونیان لێدەکردم. ئەوسا بۆمدەرکەوت کە ژوورەکە. ژوورە کۆنەکەی نەنکم بوو. باوکیشم کە بەملاوبەولادا دەیبردم، بە چاو بەستراوی مەبەستەکەی هەر ئەوەبوو کە سەرم لێبشێوێنێت.

نەنکم کاتی خۆی لەو ژوورەدا دەژیا پێش ئەوەی کە بگوێزێتەوە بۆ ماڵی پورە فاتم. ئیتر دوای گوێزانەوەی نەنکم ژوورەکە چۆڵبوو

کەسی تێدا نەبوو. تەنها هەندێک بەڕە شڕە و ئامرازی بەڕەچنینی تێدابوو. بەڵام ئێستا ئەوانەی لێنەبوو. من وامدەزانی ئەم ژوورە جادوگەرێکی تێدا دەژی. دایکم بە گاڵتەوە پێی وتم ئەو جادوگەرە و باوکم ئەم ژوورەیان بە تەلیسم جوان کردووە و تەنها بۆ خاتری من دروستیانکردووە کە ببێتە دیاری جەژنی لەدایکبوونم. منیش لە خۆشیاندا یەک قیژەم کرد. بەلامەوە باشترین دیاری بوو کە من لە ژیانمدا وەرمگرتبێت.

باوکم بەتەلیسم ئەو کاغەزی دیوارانەی بۆ تێگرتبووم. کاغەزی چی پڕبوون لە گوڵی وردی جوانی ڕەنگاوڕەنگ..

باوکم وتی دایکیشت لە تەلیسمکردنەکەدا بەشداری کردووە. ئەو بە تەلیسم پەردەی پەنجەرەی بۆ دوریبووم و هەروەها بەڕەیەکی بۆ چنیبووم، کە لە ناو ژوورەکەدا ڕاخرابوو. بەڕەکە ڕەنگی سوور و زەرد و سەوز و ڕەش بوو. هەر ڕەنگێک بەشێوەی خەتخەت چنرابوون. ئەم بەڕەیە دایکم لە زستاندا بۆیچنیبووم خۆم لەو بڕوایەدا نەبووم ئەو ئەمەی بۆ من چنیبێت.

باوکیشم کە شەوانە خەریکی دارتاشیکردن بوو دۆڵابێک و سێ کورسی و مێزێکی خڕ و ڕەفەیەکی بۆ درووستکردبووم و، هەمووشیانی بە ڕەنگی سپی بۆیە کردبوو.

من بە شەو باوکمم دەبینی خەریکی کاری دارتاشی بوو. وامدەزانی،

کاری دارتاشی بۆ ئەو کەسانە دەکات کە نازانن وەکو باوکم کورسی و مێز دروستبکەن. من قەت لەو بڕوایەدا نەبووم باوکم ئەو هەموو شتانەی بۆ من دروستکردبێت.

شڤان و شاد خێرا قەرەوێڵەکەمیان گوێزایەوە بۆ ژوورە تازەکەم.

شڤان وتی:

"سارا گیان هیچ خەمت نەبێت شەوانە دێین بۆ لات بەسەرهاتی جنۆکەت بۆ دەگێڕینەوە."

بەپەلە بوکەشووشەکانمم گوێزایەوە. من چوار بوکەشووشەی بچکۆلانە و سێ بوکەشووشەی گەورەم هەیە. من هەموو ئەو بوکەشووشەکانی خۆمم بە جوانی پاراستبوو. هەتا ئەو بوکەشووشانەی کە بە منداڵی وەرمگرتبوون کاتێک منداڵێکی ساوابووم.

شوێنێکم لەسەر ڕەفەکە بۆ بوکەشووشە بچکۆلانەکانم کردەوە. پارچەیەک قووماشم ڕاخست، ئینجا ئەو قەنەفە بچکۆلانە جوانانەم لەسەر دانا، کە کاتی خۆی نەنکم بۆیکڕیبووم. دوایش سێ بوکەشووشە گەورەکانم لە سەر جێگەکانیان دانا.



ئەو بێشکەیەی کە ڕەزێ تێیدا دەنووست لە نزیکی قەرەوێڵەکەی خۆمەوە دامنا. بێشکە بچکۆلەکەیتر کە خوشکان و تاژانی تێدا دەنووستن، لە سووچێکیتری ژوورەکەدا دامنا. ئۆی.. ئۆی..، کە ژوورەکەم خۆش و دڵگیر و جوان بوو.

دوایی بە ڕاکردن چوومە ژووره کۆنەکەی خۆم کەلوپەلەکانی ترم هێنا، کە لە سەر ڕەفەی کوڕەکان دامنابوون.

من سیانزە کتێبم هەبوو کە هی خۆم بوون. ئەو کتێبانە و چەند گۆڤارێکم لەسەر ڕەفەکەم دانا، هەروەها قوتووی پوولە جوانەکانم هێنا کە پڕبوو لە پوولی جوان جوان. لە قوتابخانە باوبوو پوول لەگەڵ یەکتریدا بگۆڕینەوە. جوانترین پوول بەلامەوە ئەوەبوو کە وێنەی پەرییەکی گەورەی تێدابوو کە کراسێکی پەمەیی لەبەردابوو، دوو باڵی ڕەنگاوڕەنگی پێوەبوو.

هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووم بتوانم ئەم هەموو شتانە جێبکەمەوە لەسەر ڕەفەکە.

بە ڕاستی ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونم خۆشترین ئاهەنگ بوو لە ژیانمدا. تا دەمرم ئەو ڕۆژە خۆشەم لەبیر ناچێت.

ئا لەو ڕۆژەدا بووم بە خاوەنی ژووری خۆم.

# ئاهەنگ بەردەوامە

دوای نیوەڕۆ بانگهێشتی هەستیار و هانا و هاوبەشم کرد کە بێن بۆ ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونم.

ئێمە خۆمان شەش منداڵبووین و هەموومان بە باشی جێگەمان دەبووەوە لە دەوری مێزە خڕەکەم. مێزەکەم جوان ڕازاندبووەوە، جێگەی هیچیتری لە سەر نەدەبووەوە. لەسەر یەکێک لە کێکەکان نووسرا بوو "سارا حەوت ساڵ پڕ دەکاتەوە." لە دەوری مێزەکە دانیشتبووین و کێکمان دەخوارد و شەربەتی مێوژمان دەخواردەوە.



هەستیار و هانا و هاوبەش دیارییان بـۆ هێنام. هانا و هاوبەش کتێبێکی چیرۆک و هەستیاریش دوو جووت گۆرەوی جووتێکیان سوور ئەویتریان زەردبوو.

هەستیار لە تەنیشت مندا دانیشتبوو، شڤان و شادیش دەستیانکرد بە تووڕە کردنمان و هاواریان دەکرد: "دەستگیران و دەستگیران و دەستگیران و دەستگیران."

ئەوان بۆیە وایاندەوت، چونکە هەستیار وەکو ئەوان نەبوو کە یاری لەگەڵ کچاندا نەکات. بەلای هەستیارەوە گرنگ نەبوو براکانم چیبڵێن و چینەڵێن. ئەو هەندێکجار لەگەڵ من و هانا و هاوبەشدا یاریدەکرد. شڤان و شادیش حەزیاندەکرد یاریمان لەگەڵ بکەن بەڵام خۆیان واپیشاندەدا کە حەزناکەن.

ئێمە شەش منداڵین لـە لادێکەماندا، بۆ هەمووومان خـۆشتربوو یاریمـان لەگەڵ یەکتری بکـردایە. ئیتر گرنگ نەبوو کچبن یان کوڕ. بەشی هەرەزۆری یارییەکان زۆر خۆشترە ئەگەر شەش منداڵ بەشداری تێدا بکەن نەک بە تەنها سێ منداڵ.

زۆری پێنەچوو کوڕەکان چوون بۆ کۆکردنەوەی هێلکەی باڵندە. ئەو هێلکانەی کە شاد لە بەهاراندا کۆیدەکردنەوە. من و هانا و هاوبەش دەستمانکرد بە یاریکردن لەگەڵ بوکەکانماندا. بیرم نایەت بۆچی دەزووی دروومان لە گیرفانمدا بوو. دەزووەکە زۆر درێژبوو.

لەپڕ بیرێکم  بۆ هات. خێرا بە هاوبەشم وت. ئەگەر بهاتایە دەزوویەکـی ترم پەیدا بکـردایە بەقەدەر دەزووەکـەی گیرفانـم بە جوانی دەمانتوانی لە نێوان ژوورەکەی من و هانا و هاوبەشدا لەپاکەتی جگەرەدا بۆ یەکتری نامە بنێرین.

ئۆی.. ئۆی.. کـە پەلەمان بـوو زوو دەزووەکـە پەیدابکـەین. هەوڵەکەشمان بەباشی سەریگرت.

دەزووەکەمان وەکو تەناف بەست بە پەنجەرەی ژوورەکەی من و هاناوە. دەستمانکرد بە نامە گۆڕینەوە. زۆر خۆشبوو کە پاکەتە جگەرەکەم دەبینی لەمبەر دەچوو  بۆ ئەوبەر. هانا و هاوبەش لە نامەی یەکەمدا نووسیبوویان: "چۆنی سارا؟"

منیش وەڵامم دانەوە: "باشم  هیوادارم ئێوەش باشبن."



ورده ورده یارییەکەمان خۆشتر و خۆشتر دەبوو. ئێمە وامان دانابوو کە کچە شازادەین و لە دوو کۆشکی نزیکی یەکتریدا بەندکراوین. ئێمە نەماندەتوانی خۆمان ڕزگاربکەین چونکە ئەژدیهایەکی دڕندە پاسەوانمان بوو. هانا و هاوبەش نووسیان:

"ئەژدیهاکەی ئێمە دڕندەیە، ئەی ئەژدیهاکەی ئێوە چۆنە؟ ئیمزا شازادە هانا و شازادە هاوبەش."

منیش وەڵامم دانەوە: "بەڵێ ئەژدیهاکەی منیش دڕندەیە و من زۆری لێدەترسم و گازم لێدەگرێت ئەگەر لە ژوورەکەم بڕۆمە دەرەوە. هەر باشە کە ئێمە بەلای کەمەوە، دەتوانین نامە بۆ یەکتری بنێرین و دڵی یەکتری بدەینەوە. ئیمزا شازادە سارا."

زۆری پێنەچوو دایکم بانگیکردم بۆ ئەوەی قاپەکانی لەگەڵدا وشک بکەمەوە. کاتێک کە من لە ژوورەکەم نەبووم شڤان و شاد و هەستیار، هاتبوونە ژوورەکەم و نامەکانی هانا و هاوبەشیان خوێندبووەوە. شڤان لە جیاتی من، وەڵامی هانا و هاوبەشی دابووەوە: "بەداخەوە ئێستا شازادە سارا لێرە نییە. ئەم شازادە بەڕێزە خەریکی چڵم سڕینە. لە جیاتی ئەو دەستەیەک شازادەی لێیە. ئیمزا شازادە لاش ئەلکساندەر ناپلیۆن."

ئەوەی لە هەموو شتێک خۆشتربوو، ژوورەکەی من بەرامبەر بە ژوورەکەی هانا و هاوبەش بوو.

بە زستانان کە تاریک دەبوو. بە هۆی گڵۆپی دەستییەکەمان دەمانتوانی ڕاسپاردە بۆ یەکتری بنێرین. ئەگەر بهاتایە سێ جار گڵۆپەکەمان داگیرساندایە و بمانکوژاندایەتەوە. ئەوە مانای ئەوە بوو، من ئیشێکی گرنگم پێتانە خێرا وەرن بۆ لام. زۆری نەدەخایاند دەچووین بۆ سەردانی یەکتری.

دایکم فێریکردم کە هەمیشە ژوورەکەم بە پاکوخاوێنی ڕابگرم. منیش ئەوەی لە توانامدا بوو دەمکرد. هەندێکجار بە باشی ژوورەکەم پاکدەکردەوە. بەڕەکانم لە پەنجەرەکەوە فڕێ دەدایە دەرەوە. باجی توبا بە شوڵکێک دەیکێشا بە بەڕەکانمدا. هەرچی تەپوو تۆزی پێوە بوایە لێی دەکردەوە. منیش شوڵکێکم هەیە هەر بە تەواوەتی هی خۆمە. جاروبار منیش بە شووڵکەکەم تەپوتۆز لە بەڕەکانم دەکەمەوە.



زۆربەی جار گسکی ژوورەکەم دەدەم و بە جوانی دەیسڕم. بڕوام پێبکەن جاری وا هەیە ژوورەکەم ئەوەندە پاکە دەڵێی ئاوێنەیە هەمــوو شوێنێکی شــەوق دەداتەوە، تاوەکــو دەسکی دەرگای ژوورەکەشم .

لە گوڵدانی ناو ژوورەکەمدا گوڵی جۆراوجۆرم ناشتووە و بێشکەی بوکەشووشەکانم جوان ڕاگرتووە. هەندێکجاریش ژوورەکەم پیس و پۆخڵە. ئیجا دایکم بیرم دەخاتەوە کەمن ناو بە ناو کچێکی تەمەڵم و ژوورەکەی خۆم بە پاکوخاوێنی ڕاناگرم.

# پشووی هاوین هات

چەند خۆشە کە پشووی هاوین دەستپێدەکات. هەر لەو ڕۆژەوە کە قوتابخانە دادەخریت. هەموو شتێک لەبەرچاومدا شیرین دەبێت.

من تـا ئێستا تەنها یەکجار پێشتر بەشـداری ئاهەنگی کۆتایی قوتابخانەم کردووە.

ڕۆژێک پێش ئەوەی پشووی هاوین دەست پێبکات. ئێمە دەبوایە هۆڵی قوتابخانەکەمان جوان بڕازاندایەتەوە.

ئێمەی منداڵانی دێ بچکۆل چەپکە گوڵی ڕەنگاوڕەنگمان چنی و گەڵا و لقی ناسکی دارمان کۆکردەوە. بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا بیبەین بۆ قوتابخانە.

قوتابخانە لە ئاواییەکەماندا نەبوو. خۆ نەدەکرا بۆ شەش منداڵ قوتابخانەیەک بکەنەوە. ئێمە بەیانی زوو هەڵدەستاین و دەڕۆیشتین بۆ ئاوایی گەورەدێ چونکە قوتابخانەکەمان لەوێ بوو.

ڕۆژی دوایی کە گەیشتینە قوتابخانە گوڵەکانمان سیس و ژاکابوون. بەڵام هەر کە ئاویان گەیشتێ یەکسەر گەشانەوە. قوتابخانەکەمان زۆر بۆنی خۆشبوو، واتدەزانی دوکانێکی گوڵ فرۆشە. کاتێک کە لە ڕازاندنەوەی قوتابخانەکەمان بووینەوە دەستمانکرد بە پرۆڤەکردنی ئەو گۆرانیانەی کە دەبوو لە ئاهەنگی کۆتایی ساڵدا بیانڵێین.

"خوایە وەتەن ئاواکەی، ئەی کوردینە ئەی مەردینە، هەڵۆ، تیشکی خۆر چاوەڕێتە، تۆ وا دەزانی خەمبارم چونکە یار وازی لێهێناوم."
کچێکی برادەرم کە ناوی خوشکێ بوو، بەهەڵە ئەم گۆرانییەی دەوتەوە، ئەو دەیوت:
"تۆ وادەزانی کە خەمباریت لە بەر ئەوەی من وازملێهێناوی."
خوشکێ لای وابوو کە گۆرانییەکە بەو جۆرەیە. بەڵام ئەو شانسی هەبـوو. مامۆستاکەمان گۆرانییەکەی بـۆ ڕاستکردەوە، بۆئـەوەی خوشکان بە دروستی گۆرانییەکە بڵێت لە ئاهەنگی کۆتایی ساڵدا.



ئاووهەوا ئێجگار خۆشبوو. پێکەوە هەمووومان دەڕۆیشتین دەمەو ئێوارە گەیشتینە ماڵەوە. کاتێک بەڕێگاوە بووین بۆ ماڵەوە شڤان وتی:

"ئەمرۆ بۆتان هەیە بەسەر بەردی قەراخ ڕێگاکەدا بڕۆن."

ئەمەش یارییەک بوو کە پێکەوە جاروبار دەمانکرد. یارییەکە خۆی وا بوو ئەوەی قاچی لەسەر بەردەکە بترازایە و بکەوتایەتە سەر زەوی ئەوا مانای ئەوە بوو ئەوکەسە مردووە. هەستیار قاچی کەوتە سەر زەوی و شاد پێیوت: "هەستیار، تۆ ئێستا مردوویت؟"

هەستیار بە سەرسوڕمانەوە دەیوت: "ئەرێ تۆ شێت بوویت. مردنی چی نابینیت کە من زیندووم."

هەستیار خۆیدابوو بە زەویدا و پێدەکەنی و قاچ و دەستی بە ئاسماندا ڕادەوەشاند. ئێمەش هەمووومان تا توانامان بوو دامانە قاقای پێکەنین.

دوایی بە قەراخ شەقامەکەدا دەڕۆیشتین و لەپڕ شڤان وتی:

"بەڕای ئێوە کێ بڕیاری ئەوەی داوە کە دەبێت تەنها هەر بەسەر شەقامدا بڕۆیت و بە شوێنی تردا نەڕۆیت؟"

هانا وەڵامی دایەوە:

"بە دڵنیایی پادشا بڕیاری لەسەر ئەوشتە گرنگانە داوە."

شڤان خێرا وەڵامی هانای دایەوە: "ڕاستدەکەیت وایە."

دوایی یەک لە دوای یەک بە ڕیز بەسەر دیوارە نزمەکاندا دەڕۆیشتین.

ماوەیەک ڕۆیشتین کاتێکی خۆشمان بەسەر دەبرد. من بیرم لەوە دەکردەوە کە ئیتر پێ نەخەمە سەر زەوی. بۆ نەگبەتی ئێمە پیاوی عەرەبانەی شیرەکە، مام ئەخۆل بە خۆی و عەرەبانەکەیەوە تێپەڕی بەلاماندا: "ئەریٚ بۆ بە ڕێگای ئاسایدا ناڕۆن. خۆ ئێوە قەلەڕەش نین بەسەر دیوارەوەبن؟"



ڕۆژی دوایی کە ڕۆیشتینەوە بۆ قوتابخانە. نەدەکرا بەسەر دیوارەکاندا بڕۆین. چونکە ئاهەنگی کۆتایی ساڵ بوو، ئێمەش جلی جوانمان لەبەرکردبوو. هانا و هاوبەش هەردووکیان کراسی شینیان لەبەردابوو. منیش یەک کراسی تازەی پەمەیی کە خاڵخاڵی سووری تێدابوو. لەگەڵ تەوقەیەکی زەردی جوانم دابوو لە قژم. هەروەها پێلاوی نوێم لە پێدابوو.

دایکەکانمان و باوکەکانمان لە هۆڵی قوتابخانەکەماندا دانیشتبوون و چاوەڕوانی ئەوەیاندەکرد کەی تاقیکردنەوەکەمان دەستپێبکات. من بە دروستی وەڵامی هەموو پرسیارەکانی مامۆستام دایەوە. بەڵام شاد نا. کە لەویان پرسی حەوت کەڕەت حەوت دەکاتە چەند. شاد وەڵامی دایەوە و وتی حەوت کەرەت حەوت دەکاتە پەنجاو شەش. شڤان ڕووی بۆ شاد وەرچەرخاند و بە ئەسپایی پێیوت:

"نەخێر.. نەخێر.، دەکاتە چل و شەش."

خۆی حەوت کەرەت حەوت دەیکردە چل و نۆ. من خۆم دەمزانی چل و نۆ دەکات. هەرچەندە من خشتەی لێکدانم نەخوێندبوو. بەڵام گوێم لێی بوو کە قوتابییەکان دەیانوت حەوت کەرەت حەوت دەکاتە چل و نۆ. قوتابخانەکەمان تەنها بیست و سێ قوتابی تێدابوو. هەمووومان لە هۆڵی قوتابخانەکەدا دانیشتبووین.

دوای تاقیکردنەوەکە، ئاهەنگ دەستیپێکرد. ئێمەش دەستمان بە گۆرانی وتنکرد. هەر کە دوا گۆرانیمان وت "ئێستا کاتی گەشانەوەی گوڵ هاتووە." مامۆستاکەمان پێی وتین:

"خوداتان لەگەڵ منداڵە خۆشەویستەکان. هیوادارم هاوێنێکی زۆر خۆش بەسەربەرن."

منیش لە خۆشیدا نەمدەزانی چیبکەم. هەستێکی وام لەلا دروست بوو کە ئیتر دڵم لە سینەمدا ئۆقرەی نەدەگرت.

هەموو منداڵانی ئاواییەکەمان بڕوانامەی باشمان وەرگرت. ئێمە نمرەکانمان لەگەڵ یەکتریدا بەراورد دەکرد. نمرەی هەموومان لە شاد باشتر بوو. بەڵام ئەو خراپی واش نەبوو. ئەگەر ئەومان بەراورد بکردایە لەگەڵ قوتابییەکانی تری ئاوایی گەورەدێدا.

سەر لە ئێوارەکەی یاری فتبۆڵێنمان کرد. جارێکیان تۆپەکە کەوتە ناو شەخەڵانێکی چڕەوە. منیش چووم تۆپەکە بهێنمەوە. کەچی یانزە هێلکەم دۆزییەوە. زۆر دڵم پێی خۆش بوو. ئەم هێلکانە هی مریشکە ڕەشەکەمان بوو، کە جاروبار تەرە دەبوو لێمان. مریشکە ڕەشە لە کولانەکەی خۆیدا هێلکەی نەدەکرد. مریشکە ڕەشە تا بڵێی فیڵباز و بە ئاگابوو. هەموو جارێک لە ملاولەولا هێلکەی دەکرد و هەر جاری لە شوێنێکدا دەیشاردنەوە. ڕۆژانە من و شڤان و شاد دەگەڕاین بۆ ئەوەی هێلکەکانی بدۆزینەوە.

هەر هێلکەیەکمان بدۆزیایەتەوە، دایکم دوو فلس بەخشیشی دەداینێ. منیش بۆ خۆم یانزە هێلکەم دۆزییەوە کە دەیکردە بیستودوو فلس. من هاتم تۆپەکە بهێنمەوە کەچی یانزە هێلکەم دۆزییەوە. کە گەڕامەوە بۆ لایان شڤان هێلکەکانی بینی و پێی وتم:

"سارا ئەو هێلکانەم بدەرێ، با لەجیاتی تۆپ، شەق شەقێنیان پێبکەم."



من گوێم بە قسەکەی شڤان نەدا و هێلکەکانم خستە بەرۆکی کراسەکەمەوە و چووم بۆلای دایکم. دایکیشم بیستودوو فلس بەخشیشی دامێ. یەکی دوو فلسم لێ بەخشییەوە بەسەر منداڵەکاندا. باقیەکەیم خستە نـاو دەخیلەکەمەوە. بـە کلیلە بچکـۆلانەکەم دەخیلەکەم داخست. کلیلەکەشم هەڵواسی بە بزمارێکەوە کە لەناو دۆلابەکەمدا داکوترابوو.

زۆری نەبرد هاوبەش لەناو شەخەڵەکاندا تۆپەکەی دۆزییەوە چەند کاتژمێرێکی تریش بەیەکەوە یاریمانکرد.

کاتێک چوومە ناو جێگەوە، شەو زۆر درەنگ بوو. بەڵام گرنگ نەبوو چونکە یەکەمین ڕۆژی پشووی هاوینمان بوو.

## شێلم هەڵکەندن و دەستکەوت، پشیلەیەک



دەخیلەکەم پارەی زۆری تێدا بوو. هەموو ڕۆژێک ڕۆژانەی خۆمم لەگەڵ هەقدەستی هەڵکەندن و پاککردنی شێلمدا دەخستە ناو دەخیلەکەمەوە.



هەر بە تەنها من هەقدەستم وەرنەدەگرت، بەڵکو شڤان و شاد و هەستیار و هانا و هاوبەشیش وەریاندەگرت.

خۆی لە ڕاستیدا دەبوایە من و براکانم تەنها خەریکی هەڵکەندنی شێلمیماڵی خۆمان بووینایە. هەستیاریش هی ماڵی خۆیان. هانا و هاوبەشیش هی ماڵی خۆیان. کەچی ئێمە خەریکی هەڵکێشانی شێلمی هەموو لایەکبووین.

هەڵکەندنی هەر دێراوێک جۆرێک هەقدەستمان وەردەگرت. دێراوە درێژەکان بیست فلس و دێراوە کورتەکانیش دە فلس.

من و هانا و هاوبەش ڕەفتەمـان بەسەرەوە بـوو، بەرۆکمان لەبەرکردبوو بۆ ئەوەی ئەژنۆمان لە کاتی نووشتانەوەدا ئازاری پێنەگات. دایکم پێی دەوتین:

"کچینە هەر لە ئافرەتی بچکۆلانە دەچن."



لەگەڵ خۆماندا سەتڵێک شەربەتمان هێنابوو. کە تینومان دەبوو شەربەتەکەمان دەخواردەوە. جاروباریش بە قامیشێک شەربەتەکەمان هەڵدەمژی. بەلامانەوە خۆشتر بوو کە بە قامیشەکە شەربەتەکە بخوێنەوە نەک لە جامەکەدا. زوو زوو تینومان دەبوو، زوو زوو شەربەتەکەمان دەخواردەوە. زۆری پێنەچوو هەموو شەربەتەکەمان تەواوکرد.

شڤان سەتڵەکەی برد و پڕیکرد لە ئاوی سارد و هێنایەوە. ئەوسا دەستمانکرد بە ئاوی سارد خواردنەوە. ئاوەکە تینوێتی دەشکاندین بەڵام وەک شەربەتەکـە خۆش نەبوو. هەستیار ئەوەنـدە ئاوی خواردەوە ئیتر نەیدەتوانی دانیشێت بۆیە لە ناو کێڵگەی شێلمەکەدا پاڵکەوت و دەستیکرد بە هاوارکردن:

"بگەنە فریام. سکم خەریکە دەتەقێت. گوێتان لێیە چۆن سکم دەقۆڕێنی."
ئێمەش چووین بۆ لای هەستیار. کاتێک هەستیار خۆی دەجوڵاندەوە ئاوی ناوسکی وەک ئاوی ناو جەوەنە دەهات و دەچوو.



لەگەڵ شێلم هەڵکەندندا قسە و باسمان دامەزراندبوو. شڤان هەمیشە بەسەرهاتی جنۆکەی دەگێڕایەوە. بەڵام من بەلامەوە هیچ ترسناک نەبوو چونکە ڕۆژی ڕووناک بوو.
شڤان دەیویست پێشبڕکێ لە سەر قسەی ناشیرین بکەین. کێ دەتوانێت ناشیرینترین جنێو بدات. من و هانا و هاوبەش نەمانویست لەو پێشبڕکێیەدا بەشداربین. چونکە مامۆستا پێی وتبووین کە تەنها خەڵکی چەورە خەریکی قسەی ناشیرینن. شڤان لەبەر خۆیەوە چەند جنێوێکی ناشیرینیدا بەڵام کەسمان وەڵاممان نەدایەوە ئەویش ناچار بوو واز لە وتنی قسەی ناشیرین بهێنێت.
بەلامانەوە هەر یەکەم ڕۆژی شێلم هەڵکەندن خۆشبوو. دوایش هەر دووبارە کردنەوە بوو.

بەڵام چارەمان نەبوو دەبوایە ئێمە خەریکی شێلم هەڵکەندن بووینایە. جارێکیان تازە دەستمانکردبوو بە ئیش شڤان بەزمانێکی سەیر قسەی لەگەڵ هەستیار دەکرد:

"پیترۆسکە سشمدۆ بومبوم"

هەستیار وەڵامی دایەوە: "کولیفینک، کولیفینک"

شاد وتی: "مویسی دۆیسی فیلبوم دەرەرات."

من لێم پرسین ئەوان دەڵێن چی شڤان وەڵامی دامەوە: "سارا گیان ئەوە زمانێکی تایبەتییە تەنها کوڕان لێی تێدەگەن. ئەمەش هەر لەبەرئەوەی کە زمانەکەمان سەخت و گرانە و کچان ناتوانن فێری بن."

هانا پێی وتن: "ڕاستدەکەن. ئێوە خۆتان کە زمانەکەتان داهێناوە. نازانن دەڵین چی."

هەستیار یەکسەر وەڵامی هانای دایەوە: "نەخێر.. نەخێر.، ئێمە باش دەزانین دەڵێین چی. ئەوەی کە من وتم مانای ئەوەیە" کوڕینە، ئەمرۆ ئاووهەوا زۆر خۆشە."

شادیش وتی: "بەڵێ.. بەڵێ.، بەختێکی باشمان هەیە کە کچەکان لێمان تێناگەن."

کورەکان بە زمانەکەی خۆیان بەردەوام بوون لە قسەکردن. لە کۆتایدا هانا بە ئەوانی وت: "کوڕینە دەزانن ئێمەش زمانی تایبەتی

خۆمانمان هەیە بە تەنها کچان لێی تێدەگەن"
ئێمەش بە دەم هەڵکەندنی شێلمەوە بە زمانە تایبەتەکەی خۆمان قسەمان لەگەڵ یەکتریکرد. من هیچ جیاوازییەکم نەدەبینی لە نێوان زمانەکەی ئێمە و ئەواندا. کەچی شڤان دەیوت زمانەکەی ئەوان خۆشترە لە هی ئێمە. چونکە ئەوەی ئەوان لە ڕووسییەوە نزیکە. هەرچەندە ئەوەندەی ئێمە لە زمانەکەی ئەوان تێگەیشتبووین مانای "بەڵێ بەلێ بوو".
هەستیار چەند جارێک وشەی "کولیفینک، کولیفینک"ی دووبارە کردەوە. ئێمەش لە داخاندا ناوی هەستیارمان نا: "هەستیارە کولیفینک"
دوای نیوەڕۆ بوو ئێمە خەریکی شێلم پاکردن بووین. کاتی پشوودانمان هات ئێمەش نانە چەورەمان دەخوارد و ئاوی ساردمان دەخواردەوە. لەپڕ ئاسمان دای بەیەکدا و ڕەش داگیرسا. هەورە تریشقە دەیشریخاند بە ئاسماندا. زۆری نەبرد تەرزە کەوتە بارین. بەڵام چ تەرزە بارینێک. لە بارینی کلو بەفر دەچوو لە زستاندا. ئێمەش بە پێی پەتی تا توانامان بوو ڕاماندەکرد. کاتێک کە پێمان دەنا بە تەرزەکاندا واماندەزانی بەسەر سەهۆڵدا ڕادەکەین.
شڤان وتی با ڕابکەین بۆ ماڵی پوورە گوڵچین. ئێمە هەموو جارێک بە قسەی شڤانمان دەکرد. بۆیە ئەو جارەش لە قسەی شڤان دەرنەچووین.

ماڵی پووره گوڵچین زۆر لێمانەوه دوور نەبوو. ئەو لە خانوویەکی هاوینەی سووری بچکۆلانەدا بە تەنها دەژیا. ئێمە ڕامانکرد بۆ ئەوێ و بەختمان هەبوو، کە پووره گوڵچین لە ماڵەوە بوو. پووره گوڵچین پیربوو پێ دەچوو هاوتەمەنی نەنکم بێت. بەڵام زۆر میهرەبان و ڕووخۆش بوو. من بۆ خۆم زۆر جار دەچووم بۆ سەردانی و لەلای دەمامەوە. پووره گوڵچین کە بینینی بە زمانێکی شیرین هاواری لێکردین: "ئۆی، گوڵە خۆشەویستەکانم. منداڵە ئەزیزەکانم خێرا وەرنە ژوورەوە. ئەگینا نەخۆش دەکەون."

پوره گوڵچین لە ناو زۆپای ژووری دانیشتنەکەی ئاگرێکی گەرمی بۆ کردینەوە. جلە تەڕەکانمان لەبەرداکەند و قاچ و دەستمان لەبەر گڕی ئاگرەکە گەرم کردەوە. پووره گوڵچین لەناو زۆپاکەدا قۆرییەک چای لە سەر سێپایەک دانا بوو. پووره گوڵچین سێ پشیلەی هەبوو. یەکێکیان تازە چوار بەچکەی کردبوو. بێچووەکان



لە نێو زەمیلەیەکدا بوون زۆر جوانبوون خەریکی میاو میاوێن بوون. پووره گوڵچین وتی:



"مەجبوورم سێ بێچووە پشیلەکە ببەخشم و تەنها یەکێکیان بهێڵمەوە ئەگینا ماڵەکەم پڕ دەبێت لە پشیلە و ئیتر بۆ خۆم جێگە نامینێتەوە."

هاوبەشیش بە زمانێکی شیرین بە پورە گوڵچینی وت:
"ئۆی... کە ئێمە پشیلەمان خۆشدەوێت. بۆمان هەیە سێ بێچووە پشیلەکە لەگەڵ خۆماندا ببەینەوە بۆماڵەوە؟"
پوورە گوڵچین وتی ئەو حەز دەکات بێچووەکانمان بداتێ. بەڵام دایک و باوکمان لەوانەیە ڕازی نەبن کە ئێمە بێپرس بێچووە پشیلە بەرینەوە. هاناش بە پورە گوڵچینی وت:
"کەس هەیە بێچووە پشیلەی خۆش نەوێت."
ئێمە زۆر پاڕاینەوە و داوامان لە پورە گوڵچین کرد تەنها بۆ تاقیکردنەوە بێچووە پشیلەکان ببەینەوە بۆ ماڵەوە. ئەگەر دایک و باوکمان نـاڕازی بوون مەرج بێت بێچووەکان بگەڕێنینەوە بۆ شوێنی خۆیان. خۆشی لەوە دابوو کە بێچووە پشیلەکان بەشی هەر سێ خێزانەکەمانی دەکرد. شڤان بێچوویەکی سپی هەڵبژارد کە پەڵەپەڵەی ڕەش بەلەشیەوە بـوو. بێچووە پشیلەکـەی هانا و هاوبەش قاوەیی بوو، هی هەستیاریش ڕەشی تۆخ بوو.



که جلەکانمان وشکبونەوە بە خۆمان و بێچووە پشیلەکانەوە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. من دڵخۆشبووم چونکە دایکی بێچووە پشیلەکانیش یەک بێچووی بۆ مابوەوە.

ئێمە بێچووە پشیلەکەی خۆمان ناونا "گوربە"، هانا و هاوبەشیش ناوی بێچووە پشیلەکەی خۆیان نا "بۆرە" و هەستیاریش ناوی بێچووە بشیلەکەی خۆی نا "گوێقنج" لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو دایک و باوکمان نارازی نەبوون کاتێک بە خۆمان و بێچووە پشیلەکانەوە هاتینەوە بۆ ماڵەوە.

من هەموو ڕۆژێک یاریم لەگەڵ گوربەدا دەکرد. دەزووییەکم دەبەست بە پەڕەکاغەزێکەوە و ڕامدەکرد بە چوار دەوردا. گوربەش ڕایدەکرد بە شوێنمدا دەیویست پەڕەکاغەزەکەم لێبسەنێت.



شڤان و شادیش یاریاندەکرد لەگەڵ گوربەدا بەڵام ئەوان زوو تاقەتیان دەچوو. تەنها من بووم ئاگام لە گوربە بوو شیر و خواردنم دەدایە.

گوربە لە قاپێکدا شیری دەخواردەوە. بەڵام ئەو وەک مرۆڤ شیرەکەی نە دەخـواردەوە. ئەو بەزمان شیرەکـەی دەلێسایەوە. زەمیلەیەکم بۆ گوربە درووستکردبوو بۆئەوەی تێیدا بنوێت. لەناو زەمیلەکەدا پەتۆیەکی نەرم و شلم بۆ ڕاخستبوو.

هەندێکجار لە حەوشەکەماندا ، گوربە و گوێقنج و بۆرەمان پێکەوە بەرەڵا دەکرد. بۆ ئەوەی پێکەوە یاری بکەن. ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە هەرسێ پێچووە پشیلەکە برا و خوشکی یەکتر بوون و دڵیان بە یەکتری دەکرایەوە.

دەسکەوتی ئەو هاوینەم لـە هەڵکەندن و پاککردنی شێلمدا نۆ پەنچایی و چل فلس بوو. هەموو پارەکەم خستە ناو دەخیلەکەمەوە. من پارەم بۆیە کۆدەکردەوە بۆئەوەی پاسکیلێکی سووری پێبکرم.

# هەستیار بوو بە خاوەنی سەگی خۆی

هەستیار تاقانەیە. بەڵام ئەو سەگێکی هەیە ناوی بازەیە و پێچووە پشیلەیەک کە ناوی گوێقنجە.

من دەمەوێت باسی ئەوەتان بۆ بگێڕمەوە چۆن چۆنی هەستیار بوو بە خاوەنی سەگی خۆی. هەربەو شێوەیە بۆتان دەگێڕمەوە کە هەستیار خۆی بۆ منی گێڕاوەتەوە.

پینەچییەک ناوی بەستەزمان بوو دوکانەکەی لە نێوان ئاواییەکەی ئێمە و گەورەدێدا بوو. ئەم پینەچییە بە پێچەوانەی ناوەکەیەوە دڵنەرم و میهرەبان نەبوو.



بەستەزمان هەرگیز لە کاتی خۆیدا پێڵاوی کەسی چاک نەدەکردەوە. بە مەرجێک پێشتر ئەو بەڵینی دابوونێ بەڵام کاتێک کە خەڵکی دەچوون پێڵاوەکانیان بهێننەوە بەستەزمان هێشتا بۆی چاک نەکردبوون.

ئەمەش لەبەرئەوەی وەکو باجی توبا دەیوت بەستەزمان زۆربەی کات خەریکی خواردنەوەیە. بەستەزمان سەگەکەی خۆی خۆش نە دەویست و میهرەبان نەبوو لەگەڵیدا.

بازە ناسراو بوو بە یەکێک لـە سەگە تورەکانی هەمـوو ناوچەکە. هەموو کاتێک بازە بەسترابووەوە بە کولانەکەیەوە خۆ یەکێکیش ئەگەر بچوایە پێڵاوەکەی لەلای بەستەزمان بهێنایەتەوە ئەوا بازە هەر خەریکی وەڕین بوو و هەرگیز لە وەڕین نە دەکەوت.



ئێمە زۆر لە بازە دەترساین قەت نەماندەوێرا نزیکی ببینەوە. ئێمە نەک هەر لە بازە دەترساین بەڵکو لە خاوەنەکەشی.

بەستەزمان کابرایەکی زۆر تورە بوو. بەلای ئەوەوە منداڵان هەموویان هاروهاجبوون. دەبوایە ڕۆژی چینێک لێدانیان بخواردایە. هەرچەندە بازە سەگ بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ڕۆژێک تێهەڵدانی دەخوارد بە دەست بەستەزمانەوە. لەوانەیە بەستەزمان لەو بڕوایەدا بووبێت کە سەگیش دەبێت وەکو منداڵ هەموو ڕۆژێک دارکاری (فەلاقە) بکرێت. کاتێکیش کە بەستەزمان سەرخۆشدەبوو. ئیتر بیری دەچوو نان و ئاو بدات بە سەگەکەی. جاری وا هەبووە بازە ئەوەندە برسی بووە ئیتر لە برساندا توانای وەڕینیشی نەماوە.

ئەو کاتەی کە بازە لەلای پینەچی بوو. من ئەوم بە سەگێکی زۆر هار و تووڕە دادەنا. هەروەها زۆر پیس و پۆخڵ و توکنیش بوو. هەمیشە مۆڕەی دەکرد و خەریکی وەڕین بوو.

بەڵام ئێستا بازە بەلای منەو سەگێکی ئاقڵ و جوانە. ئەویش لەبەرئەوەی هەستیار سەگەکەی ئاقڵ کردووە. چونکە هەستیار خۆیشی کوڕێکی ئاقڵ و سەلار و ڕێکوپێکە.

جارێکیان هەستیار چوو بوو بۆ ئەوەی پێڵاوەکانی لەلای بەستەزمان بهێنێتەوە. بازەش وەک جاری جاران خۆی ڕاپسکاندوە و وەڕیوە. لەوە چووە کە بازە ویستبێتی پەلاماری هەستیار بدات. هەستیاریش تۆزێک لە دوور بازە وەستاوە و پێی وتوە: "تۆ سەگێکی جوانیت پێویست بەوە ناکات هەمیشە بوەڕیت و مۆڕە لە خەڵکی بکەیت."

بەڵام بازە هەروەک جاران وەڕیوە و وەکو سەگێکی ئاقڵ خۆی پیشان نەداوە. هەستیار بەلای کەمەوە چوار پێنج جارێک چۆتەوە پێڵاوەکانی لەلای بەستەزمان بهێنێتەوە. هەموو جارێکیش لەگەڵ خۆیدا پلە گۆشتێکی بۆ بازە بردووە. ئەویش هەر وەک جاران بە هەستیار وەڕیوە و مۆڕەی لێکردووە. بەڵام کاتێک بازە قەپی لە پلە گۆشتەکە گرتووە، لە خۆشیدا بێدەنگ بووە. هەستیار وەک جاران دوور وەستاوە و بە بازەی وتووە کە بازە سەگێکی ئاقڵ و جوانە. هەستیار چەند جارێکی تریش چووەتەوە بۆ هێنانەوەی پێڵاوەکانی، کە بەستەزمان چاکی نەکردبوونەوە. هەموو جارێکیش هەستیار لەگەڵ خۆیدا پلە گۆشتێکی بۆ بازە بردووە. تاوای لێهاتووە کە ئیتر بازە بووە بە ئاشنای هەستیار و مۆڕەی لێنەکردووە. هەستیاریش دەستی بەسەری بازەدا هێناوە و سەگەکەش بۆنی بە هەستیارەوە کردووە.

ڕۆژێکیان بەستەزمانی پینەچی قاچی لەجێدەچێت. کاتێک هەستیار بەمە دەزانێت زۆر بەزەیی بە بازەدا دێتەوە. ئەو دەچێت بۆلای بەستەزمان و داوای لێدەکات تا ئەوکاتەی ئەو قاچی چاک دەبێتەوە ئاگای لە سەگەکەی بێت. بەستەزمانیش پێی وتووە:

"لاچۆ لەبەر چاووم ونبە. نەکەی نزیکی سەگی من بکەویت ئەگینا قورقوڕاگەت دەردەهێنێت."

بەڵام هەستیار چووە بۆ لای سەگەکە و دەستی هێناوە بە سەریدا. پینەچیش کە لە پەنجەرەکەوە ئەمەی بینیووە بیری گۆڕیوە و بە هەستیاری وتوە بازە لەگەڵ خۆی بباتەوە بۆ ماڵەوە.

دوایش هەستیار لەگەڵ خۆیدا بازەی هێناوە بۆ ماڵەوە. بازە لە خۆشیدا وەک شێتی لێهاتووە هەر هەڵبەز و دابەزی بووە. چونکە بازە هەمیشە بە کولانەکەیەوە بەسترابووەوە. هەستیاریش کولانەیەکی چاکی بۆ دروستکرد پووشی نوێی بۆ کولانەکە هێنا و نانی بۆ دانا و جامی ئاو خواردنەوەکەی بۆ بازە پاک کردەوە. تا ئەو کاتەی کە بەستەزمان قاچی چاک بووەوە بازە لەلای هەستیار بوو. هەستیار کاتێک بازەی دەهێنایە دەرەوە ئەو خێرا ڕایدەکرد بە شوێنی هەستیاردا. ئێمەش هەموو پێکەوە ڕاماندەکرد بە شوێنیاندا. بەڵام بازە لە هەموو کەس زیاتر هەستیاری بە دڵبوو هەر بە قسەی ئەویشی دەکرد. کەسی ترمان بۆی نەبوو بێجگە لە هەستیار زۆر نزیکی بازە بکەوێتەوە، چونکە بازە مۆڕەی لێدەکردین و دەوەڕی.

کە بەستەزمان قاچی چاک بووەوە هات بە شوێن بازەدا بۆ ئەوەی بیباتەوە بۆلای خۆی. سەرەڕای چاکە بەستەزمان زۆر قسەی بە هەستیار وتبوو: "عەمرت نەمێنیت، خووی سەگەکەمت خراپ کردوە. بازە سەگی پاسەوانی کردنە نەک سەگی ناو ماڵ. تۆ دەبوایە ئەوت بە کولانەکەیەوە ببەستایەتەوە."

بازەش لە پێشدا وایزانیبوو کە هەستیار دەیبات بۆ گەڕان. ئەو هەر هەڵبەزیوەتەوە و چاوەڕوان بووە. بەڵام کاتێک کە هەستیار ئەوی بە کولانە کۆنەکەیەوە بەستۆتەوە. ئیتر بازە بۆی دەرکەوتووە کە هەستیار ئەوی گەڕاندووەتەوە بۆ لای بەستەزمان. بازە هەر قوروسکەی هاتووە و زۆر زویر ڕوانیویەتی بە دەوربەری خۆیدا.

پاش ماوەیەک کە باوکی هەستیار بینیویەتی هەستیار چەند پەرێشان بووە بۆ سەگەکە. بە بێ ئەوەی هەستیار خۆی بزانێت چووە بۆ لای بەستەزمان و سەگەکەی لێکڕیوە.

بازە هاتەوە بۆ ئاواییەکەمان. ئێمەش هەموو منداڵانی ئاوایی چووین بۆ ماڵی هەستیار. ئەو خەریکی شتنی بازە بوو لە تەشتێکدا. ئێمەش تۆزێک یارمەتی هەستیارماندا و کاتێک بازە پاک شۆردرا، وشککرایەوە و شانەکرا. ئەوەندە جوان بوو لەوە دەچوو سەگێکی دیکە بێت.



ئێستا بازە قەت وەک جاران تورە نییە و شەوانەش نابەسترێتەوە بە کولانەکەیەوە. ئەو لە ژێر قەرەوێڵەکەی هەستیاردا دەنوێت. بە ڕۆژیش کە ئێمە لە قوتابخانە دێینەوە، ئەو نیوەی ڕێگاکە بەرەو پیری هەستیار دێ و جانتای مەکتەبی بۆ هەڵدەگرێت. بەڵام هەرگیز بازە نەیدەوێرا تا دووکانەکەی بەستەزمان بێت. لەوانەیە بازە لەوە ترسا بێت کە بەستەزمان چاوی بە بازە بکەوێت و بیباتەوە بۆ لای خۆی.

# باپیرەیەکی میهرەبان
# لە هەمووو شتێکیتر خۆشترە

زۆر خۆشە ئەگەر کەروێشک و کۆتریماڵیت هەبن، کە بە تەواوەتی هی خۆت بن. زۆر حەزمکردوە سەگمان هەبێت بەس بە داخەوە نیمانە.

ئێمە ئاژەڵمان زۆرە ئەسپ و مانگا و گوێرەکە و بزن و مەڕ. دایکیشم کۆمەڵێک مریشکی هێلکەکەری هەیە، کە ناوی ناوە (پەلەوەری دێ بچکۆل.)



دایکم هێلکەی مریشکەکانی دەفرۆشت بەو کەسانەی کە مەکینەی جووجەڵەیان هەیە. ئەوان هێلکەی زۆریان پێویست بوو بۆ ئەوەی بە مەکینەی جوجەڵە هەڵیبهێنن.

یەکێک لە ئەسپەکانمان ناوی ئەسپەڕەشە. ئەسپەڕەش ئەسپی خۆمە بەڵام بە تەواوەتی نا. بەو شێوەیە نا کە هەستیار خاوەنی سەگەکەی خۆیەتی. بەڵام کەروێشکەکانم بە تەواوەتی هی خۆمن. ئەوانم لە نێو قەفەزێکی داردا داناوە. ئەم قەفەزە کاتی خۆی باوکم بۆی دروستکردبووم. من و هاوبەش ڕۆژانە گژوگیا بۆ کەروێشکەکان دێنین. زستانان ساردە بۆیە دەبێت قەفەزەکە بگوێزمەوە بۆ کایەنەکەمان، چونکە لە زستانان‌دا ئەوێ گەرمترە. کەروێشکەکانم بەچکەی زۆر دەکەن. تا ئێستا ژمارەیەکی زۆرم لێفرۆشتووە بە شڤان و شاد.



شاد ماوەیەک خەریکی بەخێوکردنی کەروێشک بوو، بەڵام زوو تاقەتی لێچوو. شاد زوو تاقەتی لە هەموو شتێک دەچێت تەنها لە کۆکردنەوەی هێلکەی باڵندە نەبێت. دارێکی پیر لە باخچەکەماندا هەبوو ئێمە ناومان نابوو داری کونەپەپوو. ئەمەش لەبەرئەوەی کە کونەپەپوویەک هێلانەیەکی لەسەر دارەکە کردبوو. کونەپەپووەکە چوار هێلکەی کردبوو.

ڕۆژێکیان شاد بە دارەکەدا هەڵگەڕا و هێلکەیەکی لە هێلانەی کونەپەپووەکە هێنایە خوارەوە. شاد هێلکەکەی بە فوو پاککردەوە و داینا لەسەر ڕەفەی ژوورەکەی لە تەنیشت هێلکەی باڵندەکانی تردا کە ئەو پێشتر کۆیکردبوونەوە. شاد وەکـو ئەوەی گاڵتە بە کونەپەپووەکە بکات سەرکەوتەوە بـۆ سەردارەکە. لە هێلانەی کونەپەپووەکەدا هێلکەیەکی مریشکی لە تەنیشت سێ هێلکەی کونەپەپووەکەدا دانا. سەیر لەوەدابوو کە کونەپەپووەکە هەستی بە گۆڕینی یەکێک لە هێلکەکانی نەکرد. ئەو بۆ خۆی وەکو هەر هیچ ڕووینەدابێت کڕکەوتبوو لەسەر هێلکەکان.

ماوەیەکی پێچوو هێلکەکان هەڵهاتن و بـوونە یەک جوجەڵەی ڕەنگ زەرد و سێ بەچکە کونەپەپوو.

ئاخۆ کونەپەپووەکە چەند پەشۆکا بێت کە جوجەڵەیەکی بووە زەرد وەکو تۆپێکی خڕ.



کاتێک شاد بەمەی زانی خێرا سەرکەوتەوە سەردارەکە و جوجەڵەکەی هێنایە خوارەوە.

شاد لەوە دەترسا کونەپەپووەکە جوجەڵەکەی خۆشنەوێت. شاد پێی وتین:

"خوا دەیزانێت کە ئەمە جوجەڵەی خۆمە."

شاد دەزوویەکی سووری بەست بە قاچی جوجەڵەکەوە بۆ ئەوەی ئەو بیناسێتەوە لە نێو جوجەڵەکانی تردا. شاد خۆی بڕیاریدابوو. کە جوجەڵەکەی گەورە بوو دەبێت بە کەڵەشێر بۆیە ناوی جوجەڵەکەی نا (یاوەر).

دوایی شاد بۆیدەرکەوت کە جوجەڵەکەی کەڵەشیر دەرنەچوو ئیتر شاد ناچار بوو ناوی یاوەر بگۆڕێت بە مریشکەکونجە."

مریشکە کونجە لە مریشکەکانیتر زۆرتر باڵی دەدا بـە یەکدا و حەزی لـە فڕین بوو شاد دەیوت: "مریشکە کونجە بۆیە زیاتـر هەڵدەبەزێتەوە و باڵدەدا بەیەکـدا. چونکە ئەو لـە هێلانەی کونەپەپووەکەدا لە دایک بووە."

جارێکیان شڤان بڕیاریدا ئەویش ببێت بە خاوەنی گیانداری خۆی.
بۆ ئەم مەبەستە سێ تەڵەی مشکی نایەوە لە گەورەکەماندا.



شانزە جرجی کێوی بوون بە تەڵەکانی شڤانەوە.
هەر شانزە جرجەکەی لە کەنوویەکدا دانا.
دوایش پارچە قوماشێکی ڕەنگ کراوی کرد
بەکەنووەکەوە و لەسەری نووسی
"کارگەی مشکخانەی دێ بچکۆل."

هەر کە شەو داهات جرجە کێوییەکانی شڤان لە کەنووەکە دەرباز بوون بەو جۆرە کارگەی مشکخانەکەی
شڤانی برام کۆتایی پێهات.



هانا بەشڤانی وت:
"شڤان تۆ ئەو جرجە کێویانەت بۆ چییە؟
خۆ هێلکەت بۆ ناکەن."



شڤانیش بــه تووڕەییەوە وەڵامی هانای دایەوە: "تۆ چوزانیت. لەوە خۆشتر نییە خاوەنی مشکخانەی خۆت بیت."

هانا و هاوبەش نە سەگیان هەبوو نە کەروێشک. بەڵام ئەوان باپیرەیان هەبوو. باپیرە! ئەو میهرەبانترین باپیرە بوو لە سەرانسەری جیهاندا.

ئێمە هەموومان ئەومان بــە باپیرە بانگدەکرد، هەرچەندە ئــەو باپیرەی ئێمە نەبوو بەڵکو ئەو تەنها باپیرەی هانا و هاوبەش بوو.

باپیرە لە ژوورێکدا دەژیا لە قاتی سەرەوەی ماڵی هانا و هاوبەش. ژوورەکەی زۆر خۆشبوو و خۆشی تا بڵێی ڕووخۆش بــوو. ئێمە هەموومان زوو زوو سەرمان لێدەدا. بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە بێتاقەت بووینایە یان ئەو کاتانەی کە نەمانزانیایە چیبکەین.

باپیرە لەسەر کورســی جۆلانەکەی دانیشتبوو. بــە ڕیشە سپییە جوانەکەیەوە هەر لە پیاوێکی ئاینی دەچوو. (ئەم کورسییە بنەکەی لە سەر دوو داری چەماوە دانراوە کە بە ئاسانی جۆلانەی پێدەکرێت کاتێک یەکێک لەسەری دابنیشێت.)

چاوەکانی باپیرە زۆر کزببوون. ئەو بە تەواوەتی هیچی نەدەبینی. ئەو نەیدەتوانی خۆی کتێب یان ڕۆژنامە بخوێنێتەوە.

باپیرە پێویستی بە خوێندنەوە نەبوو. چونکە ئەو هەموو ئەو شتانەی

لەبەربوو کە لە کتێبەکاندا نوسرابوون. باپیرە زۆر جار بەسەرهاتی بۆ دەگێڕاینەوە زۆربەیان هی باسی منداڵی خۆی و سەردەمی کۆن بوون. ئێمە ڕۆژانە ڕۆژنامەمان بۆ دەخوێندەوە بۆمان دەگێڕایەوە کێ مردووە یاخود کێ تەمەنی پڕکردۆتەوە، ئاگاداری و باسی ڕووداوە گرنگەکان.

ئەگەر لە ڕۆژنامەکەدا بۆمان بخوێندایەتەوە هەورە تریشقە داویەتی لە شوێنێک. ئەوا یەکسەر باپیرە بەلای کەمەوە باسی دەرزەنێک هەورە تریشقەی تری بۆ دەکردین کە چۆن پێشتر داویەتی لە شوێنەکانیتر. ئەگەر بۆمان بخوێندایەتەوە کە یەکێک بە قۆچی گایەکی بەلەسە مردووە. باپیرە هەموو ئەو بەسەرهاتانەی بۆ دەگێڕاینەوە کە خەڵکی بە هەمان شێوە مردبوون. بەم شێوەیە هەموو جارێک زۆرمان پێدەچوو تا لە خوێندنەوەی ڕۆژنامەکە دەبووینەوە.

جاروباریش کوڕەکان ڕۆژنامەیان بۆ باپیرە دەخوێندەوە. بەڵام باپیرە حەزیدەکرد من و هانا و هاوبەش بۆی بخوێنینەوە. چونکە کوڕەکان بەوردی ڕۆژنامەکەیان نە دەخوێندەوە جاروبار ئاگاداری و هەواڵە گرنگەکانیان دەپەڕاند.

باپیرە لـە دۆلابەکەیدا سندوقێکی کەلـوپەلی دانابوو کوڕەکـان بۆیانهەبوو جاروبار سندوقەکە قەرز بکەن. هەرچەندە باپیرە چاوی

کز بوو ئەو یارمەتی کوڕەکانی دەدا کە بەلەمی تەختە و شتی تر دروست بکەن..

کاتێک کە کوڕەکان بیانویستایە سەربازی قوڕقوشم دروستبکەن ئەوان قوڕقوشمەکەیان لە فڕنەکەی باپیرەدا دەتواندەوە.

لەناو دۆڵابەکەی باپیرەدا ڕەفەیەکی تێدا بوو. هەموو کاتێک پڕی بوو لە سێو. بەڵام هەموو کاتێکیش نا، تەنها ئەو کاتانەی کە سێو پێگەیشتبوو. هەر جارێکیش بچووینایە بۆ لای باپیرە سەرو سێوی دەداینێ.

ئێمە لە گەورەدێ حەڵوامان بۆ دەکڕی و ئەویش دەیخستە ناو زەرفێکەوە و لە ژوورەکەی خۆی دایدەنا. هەر جارێک سەری باپیرەمان بدایە، هەم حەڵوا و هەم سێویشمان وەردەگرت.

باپیرە لە بەردەم پەنجەرەکەیدا هەندێک گوڵی دانابوو کە هەر خۆی خزمەتی دەکردن و قسەی لەگەڵ دەکردن.



بە دیوارەکانەوە چەند تابلۆیەکی جوان هەڵواسراوبوون. یەکێک لە تابلۆکان یونس ناوێک بوو کە لەناو سکی نەهەنگێکدا بوو. تابلۆکەی تریان وێنەی مارێکی قەف ئەستوری درێژ بوو پێچی خواردبوو بە زەلامێکەوە خەریک بوو دەیخنکاند.

کاتێک کە ئاووهەوا خۆش بوایە باپیرە بە خۆی و گۆچانەکەیەوە جارجار دەچوو بۆ گەڕان. لە هاوینانیشدا بەشی زۆری ڕۆژەکە لە ژێر دارتووەکەدا دادەنیشت کە لە دەرەوەی خانووەکەدا ڕووابوو. ئەو حەزیدەکرد لەوێ دابنیشێت و خۆی بداتە بەرخۆر و جاروباریش بڵێت "هۆهۆیایا."



ئێمە لێمان دەپرسی باپیرە بۆ دەڵێیت "هۆهۆیایا" باپیرەیش وەڵامی دایەوە کە ئەو بیری سەردەمی گەنجێتی خۆی دەکات. ئەو سەردەمەش

جاروبار بەخیلیم بە هانا و هاوبەش دەبرد و لە دڵی خۆمدا دەموت: "خودایە گیان بۆ باپیرەیەکی وا دڵنەرمت نەداوە بە من. من زۆر حەزمدەکرد باپیرەیەکی وا دڵنەرمم هەبوایە، باپیرەیەکی وەک ئەو لە هەموو شتێکی تر باشتر بوو.

# کوڕان ناتوانن نهێنی خۆیان بپارێزن

له شێلم هه‌ڵکه‌ندن و پاککردنی بووینه‌وه. به‌ڵام زۆری پێنه‌چوو باوکم ده‌ستیکرد به‌پووش هێنانه‌وه. باوکم هه‌موو ساڵێک هه‌مان قسه‌ی دوباره ده‌کرده‌وه:

"نابێت که‌ستان له‌گه‌ڵمدا سه‌ربکه‌ون و پووشه‌که‌م بۆ بشێلن."

به‌ڵام که‌سمان ئه‌م قسه‌یه‌ی باوکمان به ڕاستی وه‌رنه‌گرتبوو. ئێمه هه‌موو ڕۆژێک سواری عه‌ره‌بانه‌ی پووشه‌که ده‌بووین و هه‌روه‌ها له کایه‌نه‌که‌ماندا خه‌ریکی بازبازێن بووین.



شڤان ویستی پێشبڕکێی بازبازێن سازبکه‌ین. کێ بۆیرێت به‌رزترین باز بدات. پێوانی درێژی بازدانه‌که‌ش له سه‌ره‌وه بۆ خواره‌وه بوو نه‌ک له خواره‌وه بۆ سه‌ره‌وه. ئێمه به پایه‌کاندا سه‌رده‌که‌وتین بۆ بنمیچی کایه‌نه‌که و له‌وێوه خۆمان فڕێده‌دایه خواره‌وه بۆ سه‌ر پووشه‌که.

شڤان بەڵێنیدا ئەوەی پێشبڕکێکە بباتەوە مەساسەیەک وەردەگرێت.
شڤان پێشتر ئـەم مەساسەیـەی کـڕیبوو ئەوکاتەی کـە دایکم ناردبووی بۆ ئەوەی هەویرە ترش لە دووکانی مامەشێخ بکڕێت.
هەمووومان بازماندا و پێشبڕکێمانکرد و بازماندا.
دواجار شڤان سەرکەوتە سەر بەرزترین شوێن و لەوێوە خۆی هەڵدایە خوارەوە. پووشەکە بە تەواوەتی پان بوەوە و شریخەیەکی گەورەی لێهات. ماوەیەکی زۆر شڤان جوڵەی لێبڕا.
دواتر شڤان بۆیگێڕاینەوە. ئەو وایزانیوە دڵی کەوتبووە ناوسکییەوە و ئیتر جارێکی تر نایەتەوە شوێنی خۆی.
ئێمە کەسمان نەمانوێرا لە شوێنەکەی شڤانەوە بازبدەین. شڤانیش پێشبڕکێکەی بێ گزیکردن بـردەوە و مەساسەکەی خستە نـاو دەمییەوە. خۆی بە خۆی وت:
"ئەم مەساسەیە پێشکەشی شڤان دەکرێت بۆ ئەو ئازایەتییەی کە نواندویەتی لەناو کایەنەکەدا."
ڕۆژێکیان من و هانا و هاوبەش بـە عەرەبانەکەی ماڵـی ئەوان پووشمان دەگواستەوە. چووین بۆ شوێنێکی بەردەلان بۆ ئەوەی پووش کۆبکەینەوە. کەچی کەوتین بەسـەر شوێنێکدا پڕیبوو لە ڕێواس. من هەرگیز پێشتر ئەوەندە ڕێواسم نەدیبوو لە ژیانمدا.
بەڵێنماندا بەیەکتری کە هەرگیزا و هەرگیز شوێنی ڕێواسەکە بۆ کەس

ئاشکرا نەکەین. کەوتینە ڕێواس هەڵکەندن. ئێوارە کە ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵەوە. دەستمانکرد بە خواردنیان. شڤان و شاد و هەستیار یەکی سەرو دوو ڕێواسیان وەرگرت. ئەوان دەیانویست بۆیان بگێڕمەوە لە کوێ ئەو ڕێواسانەم کەندووە. منیش خۆڕاگر بووم هیچم بۆ نەدرکاندن. چونکە ئێمە بەڵێنماندابوو بەیەکتری کە نهێنییەکەمان بۆ کوڕەکان نەگێڕینەوە. بۆیە من پێم وتن:

"هەرگیز لـە ژیانمدا شوێنی ڕێواسەکان بـۆ کەس ئاشکراناکەم. چونکە ئەوە نهێنی نێوانی من و هانا و هاوبەشە."

مـن و هانا و هاوبەش وازمان لـە پووش کۆکـردنەوە هێنابوو، دەگەڕاین بە دوای دۆزینەوەی شوێنی ڕێواسی تردا. بەڵام کوڕەکان خەریکی پووش کۆکردنەوە بوون. ئێمە سەرمان سوڕمابوو چۆن ئەوان وەکو ئێمە، تاقەتیان نەچوو بوو لە پووش کۆکردنەوە.

ڕۆژێکیان حەوت شوێنی تازەی ڕێواسمان دۆزییەوە، ئێمەش بە کوڕەکانمان وت کە ئێمە حەوت شوێنمان دۆزیوەتەوە کە هەرگیز بۆ کەسیتری باسناکەین چونکە نهێنی نێوانمانە.

هەستیار بە پێکەنینەوە پێی وتین:

"ئینجا ئەوە کەی نهێنییە! لە چاو نهێنیەکەی ئێمەدا جیاوازی ئەرز و ئاسمانە."

هانا بەسەر سوڕمانەوە وتی: "باشە نهێنیەکەی ئێوە چییە؟"

هەستیار بە شڤانی وت: "بۆیان مەگێڕەوە."
بەڵام شڤان وتی:
"نا.. نا.، باشترە بۆیان بگێڕینەوە، با ئەوان بزانن کە نهێنیەکەمان وەکو نهێنیەکەی ئەوان هیچ و پوچ نییە."
"دەباشە نهێنیەکەتان چییە، دەبۆمان بگێڕنەوە."
"ئێمە حەوت ئەشکەوتمان دروستکردووە لە نێو کایەنەکەماندا. ئێمە پێتان ناڵین لـە کوێ ئەم ئەشکەوتانەمان دروستکـردووە. ئەمە نهێنییەکەمانە و فەرموو ئێوە ئەو ئەشکەوتانەمان بۆ بدۆزنەوە."
بەپەلە تێمان تەقاند بۆ کایەنەکەی خۆمان. ئەو ڕۆژە و ڕۆژی دوایی زۆر گەڕاین بـە شوێن ئەشکەوتەکاندا بەڵام تەنها یەک ئەشکەوتیشمان بۆ نەدۆزرایەوە. کوڕەکان خۆیان بە گەورە دادەنا و فیزیاندەکرد بەسەرماندا. شڤان وتی:
"بگەڕێن بەڵام هەرگیز ئەشکەوتەکان نادۆزنەوە، چونکە نەخشەی دروستکردنی ئەشکەوتەکانتان لەلا نییە. ئەگەر ئێوە نەخشەکەتان پێنەبێت ئەوا ئێوە هەرگیز ئەشکەوتەکانتان بۆ نادۆزرێتەوە."
ئێمە پێمان وتن: "باشە ئەو نەخشەیە لە کوێیە؟"
"ئێمە چۆن پێتان دەڵێین. ئێوە خۆتان بیدۆزنەوە. ئێمە لە شوێنێکی نهێنیدا شاردومانەتەوە."
من و هانا و هاوبەش دەستمانکرد بە گەڕان بە شوێن نەخشەکەدا.

بە بڕوای من نەخشەکە لە ماڵی ئێمەدا شاردرابووەوە، چونکە من دەزانم شڤان ڕێگا نادات لە شوێنێکی تردا بشاردرێتەوە.
ماوەیەک لە ژوورەکەی شڤان و شاد و هەورەبانەکەمان گەڕاین. لە ژێر قەرەوێڵەکان و دۆڵابی جلوبەرگ و زۆر شوێنیتر، بەڵام نەخشەکەمان بۆ نەدۆزرایەوە.
من بە شڤانم وت: "بەلای کەمەوە پێمان بڵێ ئایا باڵندەیە (مانای ئەوە بوو نەخشەکە لە شوێنێکی بەرزدا شاردراوەتەوە) یاخود ماسییە (مانای ئەوە بوو نەخشەکە لە شوێنێکی نزمدا شاردراوەتەوە) یاخود مامناوەندییە (مانای ئەوە بوو نەخشەکە نە لە بەرزی و نە لە نزمیدا شاردراوەتەوە). ئێمە کە جاران یاری شت شاردنەوەماندەکرد دەمانوت باڵندەیە، یان ماسییە یان مامناوەندییە.
شڤان و شاد و هەستیار دەستیانکرد بە قاقای پێکەنین.
شڤان وتی: "ماسییە، ئەرێ کوڕینە ماسی نییە."
کوڕەکان چاویان لە یەکتری دادەگرت، هەر لە مام ڕێوی دەچوون.
دواجار شڤان پێی وتین کە "باڵندەیە"، ئێمەش دەستمانکرد بە گەڕان. سەیری هەموو شتێکمانکرد بە بەرزییەوە، گڵۆپەکان، ژێر کاغەزی دیوارەکان.
شڤان پێی وتین:
"خۆتانی لەگەڵدا ماندوو مەکەن هەرگیز نەخشەکەتان بۆ نادۆزرێتەوە."

ڕۆژی دوایی باران بوو دەمویست لە ماڵەوە داستانی "هەزار و یەک شەوە" بخوێنمەوە. چووم بۆ لای هەستیار ویستم ئەو پەرتووکەی لێوەربگرم. شڤان و شاد لە دەرەوە بوون. منیش بە داری شۆڕەبییەکەدا هەڵزنام بۆ ژوورەکەی هەستیار.

جاران باڵندەیەکی بچکۆلانە هێلانەیەکی لە سەر شۆڕەبییەکە درووستکردبوو. ماوەیەک بوو ئەو هێلانەیە چۆڵبوو، چونکە باڵندەکە لە تاو براکانم گواستبوویەوە بۆ شوێنێکیتر.

کاتێک کە بە بەردەم هێلانەکەدا تێپەریم دەزوویەکم بینی کە لە هێلانەکەوە شۆڕببووەوە بۆ خوارەوە.

منیش لە دڵی خۆمدا وتم تۆ بڵێی ئەو باڵندەیە ئەم دەزووەی بۆ بردبێت بۆ هێلانەکەی؟ من لە بیرکردنەوەدا بووم و لەپڕ دەزووەکەم ڕاکێشا، سەیرمکرد کاغەزیکی پێچراو هات بە دەزووەکەوە. لە دڵی خۆمدا وتم تۆ بڵێی ئەمە چی بێت؟.

بڕوام پێبکەن ئەو نەخشەیەم دۆزییەوە کە چەند ڕۆژ ئێمە بە دوایدا دەگەڕاین. من وا پەشۆکابووم و لە خۆشیدا خەریکبوو بکەومە خوارەوە. داستانی هەزار و یەک شەوەکەم بیرچووەوە و گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی شڤان و شاد.

لەوێوە بە ڕاکردن چووم بۆ لای هانا و هاوبەش. ئەوەندە پەلەم بوو لەسەر پێپلیکانەکان کەوتم و ئەژنۆم تۆزێک ئازاری گەیشت.

هانا و هاوبەش لە خۆشیاندا گەشانەوە کاتێک کە نەخشەکەم پیشاندان. زۆر پەلەمان بوو خۆمان بگەیەنینە کایەنەکەمان. زۆری پێنەچوو هەر حەوت ئەشکەوتەکەمان دۆزییەوە.
لەناو کایەنەکەدا کوڕەکـان خەندەقی درێژیان هەڵکەندبـوو لە پووشەکەدا، هەمووشی لە نەخشەکەدا دیاریکرابوو. کاتێک کە بە سکەخشکێ دەڕۆیشتین بە ناو خەندەقەکاندا. خەندەقەکان ئەوەندە تاریکبوون کە هەموومان ترسمان لێنیشت.
"تۆ بڵێی جارێکی تر چاومان بە دەرەوە بکەوێتەوە."
شوێنەکە زۆر ترسناکبوو لە هەمانکاتیشدا جێی سەرسورمان بوو، هەرچەندە مرۆڤێکی گەورەش لـەو خەندەقانەدا دەیتوانی بـە سکەخشکێ بە نێویاندا بڕوات.
ناو خەندەقەکان تاریکستانبوو، کەچی ناو ئەشکەوتەکان ڕووناکبوو. چونکـە ئەشکەوتەکان کـەوتبوونە لای دیوارەکـانەوە و لە کونی دیوارەکانیشەوە ڕووناکی دەهاتە ناو ئەشکەوتەکانەوە.
ئەشکەوتەکان گەورە و جوانبوون، ئێمە تێگەیشتبووین کە کوڕەکان کاتێکی زۆریان تەرخانکردووە تا ئەم ئەشکەوتانەیان دروستکردووە.
دواهەمین ئەشکەوت خەندەقێکی وا درێژ بوو واتدەزانی هەر کۆتایی نایەت. بە سکەخشکێ بەناو خەندەقەکاندا دەڕۆیشتین، من لە پێشی پێشەوە بووم و هانا لە دوامەوە بوو، هاوبەشیش لە دوای دواوە.

لە حەوتەمین ئەشکەوتدا شڤان و شاد و هەستیارمان دۆزییەوە. کاتێک کە ئێمە لوتمان تەقی بە لوتیاندا ئەوان سەریان زۆر سوڕما. شڤان بە حەپەساوی پرسیاری لێکردین: "پێمنالێن چۆن ئێرەتان دۆزییەوە؟ بە پێغەمبەر نەخشەکەتان دۆزیوەتەوە."

منیش وتم: "بەڵێ وایە. چونکە دۆزینەوەی نەخشەکە ئاسانبوو. ئێوە لە شوێنێکی ئاساندا شاردبووتانەوە."

بۆ تەنها جارێک شڤان تۆزێک سەری سوڕما. دوای ئەوەی تۆزێک بیریکردەوە وتی:

"کچەکان بۆیان هەیە یاریمان لەگەڵ بکەن."

سەرانسەری ڕۆژەکە یاریمانکرد لە ئەشکەوتەکاندا. لە دەرەوە باران بە خوڕ دەباری ئێمەش لە ناو کایەنەکەدا خۆشمان بەسەر دەبرد.



ڕۆژی دوایی شڤان وتی:

"ئێستا ئێوە نهێنییەکەی ئێمەتان ئاشکرا کردووە، ئێمەش هەقی خۆمانە نهێنیەکەی ئێوە ئاشکرا بکەین."

کوڕەکان دەیانویست شوێنی ڕێواسەکانی ئێمە بدۆزنەوە. ئێمەش وتمان:

"ڕاستدەکەن. ئەگەر دەتانەوێت بیدۆزنەوە، کەس ڕێگای لێنەگرتوون. وەکو ئێمە چۆن گەڕاین بـە شوێنی ئەشکەوتەکاندا ئێوەش بـەو جۆرە بگەڕێن بە دوای شوێنی ڕێواسەکانماندا."

بۆ ئەوەی تۆزێک کارەکەیان بۆ ئاسان بکەین ، من و هاوبەش بە لقەدار لە نزیکی شوێنی ڕێواسەکانەوە نیشانەمان دانا. زۆری پێنەچوو ئەوان شوێنی ڕێواسەکانیان دۆزییەوە. بەڵام شوێنە هەرە باشەکەیان نا، چونکە ئەو شوێنە نهێنی خۆمان بوو. کە ئێمە هەرگیزا و هەرگیز نەماندەویست بۆ کەسێکیتری بدرکێنین.

# ئەمشەو لەکایەنەکەدا دەنوین

ڕۆژێکیان شاد پێی وتم: "سارا! ئەمشەو من و شڤان لە کایەنەکەی خۆماندا دەنوین. ئەگەر هەستیار لەماڵەوە ئیزن بدرێت ئەویش لەگەڵماندا دەبێت."

لە ڕاستیدا منیش زۆرم پێناخۆش بوو بۆیە لە داخا پێموت:

"تەنها کەسانی بەڕەڵا و بێجێگە و ڕێگا لە کایەندا شەو بەسەر دەبەن."

"نا.. نا.، شتی وانییە ئێمە مۆڵەتمان لە دایکمان وەرگرتووە. تۆ پێت ناخۆشە بۆیە وا دەڵێیت. خۆت لە هەموو کەس باشتر دەزانیت کە ئێمە کەسانی بێجێگە و ڕێگا نین."

بە ڕاکردن چووم بۆلای هانا و هاوبەش یەکسەر بۆم گێڕانەوە کە کوڕەکان نیازیان چییە. ئەوانیش وتیان:

"ئینجا نەچووە بچێت. ئەمشەو ئێمەش لە کایەنەکەی خۆماندا دەنوین تۆش وەرە لەگەڵماندا." منیش وتم:

"ئۆی.. ئۆی..، کەشەوێکی خۆش بەیەکەوە بەسەر دەبەین. هەرچەندە کە جێگەی داخە کوڕەکان پێش ئێمە. ئەم بیرە باشەیان بۆ هاتووە."

بە ڕاکردن گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و هیواداربووم دایکم ئیزنم بدات. دایکم ئیزنی نەدام و پێی وتم:

"سارا گیان، نابێت کچی بچکۆلانەی وەک تۆ لە کایەندا بنوێت."

منیش بە پاڕانەوەوە بە دایکم وت:
"خۆ دەبێت کچی بچکۆلانەش تۆزێک کاتی خۆش بەسەربەرێت، نەک هەر بە تەنها کوڕەکان کاتی خۆش بەسەربەرن."
دوایی دایکم دڵی پێم سووتا و ئیزنیدام کە لەگەڵ هانا و هاوبەشدا لە کایەنەکەیاندا بنووم. زۆر حەزمدەکرد زوو ئێوارە دابێت.
شڤان مەبەستی بوو بمانترسێنێت بۆئەوەی ئێمە لە ترساندا پەشیمان ببینەوە و نەوێرین لە کایەنەکەدا بنووین. ئەو پێی وتین:
"کچینە، بیستوومانە ئێوەش نیازی ئەوەتان هەیە کە لە کایەنەکەی ماڵی هانا و هاوبەشدا بنوون. بەڵام ئێمە بڕواناکەین ئێوە بوێرن لەوێ بنوون. ئایا ئێوە ناترسن جنۆکەیەک شەو بێتە سەرتان."
"بێگومان، ئێمە ناترسین و دەوێرین شەو لە کایەنەکەدا بنوین."
دەمە و ئێوارە بوو گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە و خەریکی ئامادەکردنی نانەچەورە و شتیتربووین. کوڕەکانیش بەیەکەوە گەڕانەوە، ئەوانیش وەکو ئێمە خەریکی خواردن ئامادەکردن بوون.
سەعات هەشتی شەو بوو کوڕەکان بە ڕێگاوە بوون بۆ کایەنەکە. من و هانا و هاوبەشیش بۆ کایەنەکەی ماڵی ئەوان. یەکی سەروو بەتانیمان لەگەڵ خۆماندا هێنا بوو. هەستیار بازەی لەگەڵدا بوو. ئەو خوا پێداوبوو چونکە خاوەنی سەگی خۆی بوو.
پێش ئەوەی شەوشاد لە یەکتری بکەین. شڤان بە فێڵبازییەوە پێی وتین:

"هیوادارم ئەمشەو خەوێکی خۆشتان لێبکەوێت. ئەگەر بێت و خەوتان لێبکەوێت. بیرتان چۆوەساڵی ڕابردوو، باوکی هانا و هاوبەش ڕەش مارێکی کوشت لە کایەنەکەیاندا. ئەمساڵ لەوانەیە نەک ڕەش مارێک بەڵکو ئەژدیهایەکی گەورەشی لێبێت."

شادیش پێی وتین:

"لەوانەیە ڕەشماری گەورەتری تێدابێت و لەوانەش نییە. بەڵام من دڵنیام کە جرجی کێوی زۆر گەورەی لێیە. ئۆی خوایە لە تاریکیدا ئەم جرجانە گازی تووند دەگرن."

"باشتر وایە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە لەسەر پێخەفە نەرم و شلەکەتان بنوون. قوڕ بەسەرینە خەریکی چین، ئێمە بۆ ئێوەمانە، ئیتر ئێوەش کەیفی خۆتانە."

ئێمە بە قسەی کوڕەکانمان نەکرد. بە خۆمان و بەتانی و نانە چەورەکانمانەوە بەرە و کایەنەکە ڕۆیشتین.

دەرەوە زۆر ڕووناکبوو، بەڵام ناوەوە تاریکستان بوو. من بە دەنگی بەرز پێم وتن کە لە جێگەی ناوەڕاستدا دەنووم. لە نێوانی هانا و هاوبەشدا. لە سەر پووشەکە جێگەیەکم بۆ خۆم ڕاخست. پووشەکە بۆنی خۆشی لێدەهات، بەڵام وەک دەرزی دەچەقی بە گیانمدا.

زۆری نەبرد بە باشی بەتانییەکانمان بە خۆمانەوە پێچایەوە و بە دڵخۆشی لێی پاڵکەوتین.

بۆخۆمان ڕاکشابووین و قسەمان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە. بیرمان لەوە دەکردەوە ئاخۆ چی دەبوو ئەگەر ئێمە بە تەواوەتی بێشوێن و جێگە و ڕێگا بووینـایە. هەر شەوەی لـە کایەنی ماڵێکدا ڕۆژمان بکردایەتەوە. هاوبەش لەو بڕوایەدابوو کە ژیانی ئەوان خۆشتر بووە لە ژیانی ئێمە.

کەسمان خەومان لێنەدەکەوت و لە هەمانکاتیشدا برسیمان بوو. بە هەلمانزانی کە نانە چەورەکانمان بخوێن، پێش ئەوەی بنووین.



دوای خواردنی نانە چەورەکان دنیا بێدەنگ و تەواو تاریک بوو، ئیتر دەمووچاوی یەکتریمان نەدەبینی. من دڵخۆشبووم بەوەی کە لە ناوەڕاستی هانا و هاوبەشدا ڕاکشابووم.

زۆری پێنەچوو لەپڕ لە ناو پووشەکانەوە خشە خشێکی زۆرمان گوێ لێبوو. لە ترساندا نزیکی یەکتر بووینەوە و دڵمان خێرا لێیدەدا، هانا بە چپە پێی وتین:

"تۆ بڵێی ئەمشەو کەسێکی بێجێگە و شوێن هاتبێت بۆ ئەوەی لە کایەنەکەماندا بنوێت."

بێدەنگ بۆ خۆمان ڕاکشابووین و لە ترساندا باوەشمان کردبوو بەیەکدا. زۆری نەبرد، لەپڕ گوێمان لە قیژەیەکی گەورەبوو. بەڵام چ قیژەیەک. زۆر گەورە و ترسناک بوو. لەوە دەچوو هەزار جنۆکە پێکەوە قیژاندبێتیان.

لە ترساندا خەریک بوو دڵم بوەستێت. هەرسێکمان بەیەکەوە قیژاندمان. لەپڕ گوێمان لە قاقای پێکەنینی شڤان و شاد و هەستیار بوو. ئیتر ئێمە هاتینەوە هۆش خۆمان و بۆماندەرکەوت کە جنۆکە نەهاتووەتە سەرمان. هەروەها خشەخشی پێشووتریش هەر کاری ئەوان بوو، کاتێک ئەوان بە ناو پووشەکاندا بە سکەخشکێ هاتبوون بۆ لامان. هانا لە کوڕەکان تووڕەبوو. پێی وتن نەدەبووایە ئەوان بەو جۆرە ئێمەیان بترساندایە. چونکە زۆری نەمابوو لە ترساندا دڵمان بوەستێت. هاوبەش وا هەستیدەکرد کە خوێن بە ناو دەمارەکانیدا وەکو جاران بە باشی نەدەگەڕا. هانا بە کوڕەکانی وت:

"مەرج بێت بەیانی بۆ دایکمی بگێڕمەوە."

شڤان پەشیمان بووەوە و بە نەرمی بە هانای وت:
"ئێمە ویستوومانە گاڵتەتان لەگەڵدا بکەین."
شادیش وتی: "باش بزانە ئەو کەسەی کە خەریکی قسەهێنان و قسەبردنە ، ئەو کەسە دووزمانە."
پاش ماوەیەک کوڕەکان گەڕانەوە بۆ کایەنەکەی خۆیان. ئێمەش بیرمان لەوە دەکردەوە کە بە دزییەوە بچینە سەریان و هەقی خۆمانیان لێبکەینەوە. بەڵام ئێمە هیچ وزەمان تێدا نەمابوو، زۆری نەبرد لەپڕ خەومان لێکەوت.
بەیانی کاتێک بە ئاگا هاتینەوە کەڵەشیری ماڵی هانا و هاوبەش دەیقووقاند. کە خەبەرمان بووەوە هەرسێکمان لە سەرمادا هەڵدەلەرزین. ئۆی.. ئۆی..، کە بەیانییەکی ساردبوو. نەمان دەزانی کاتژمێر چەندە، بەڵام لەو بڕوایەدا بووین کە کاتی لە خەو هەستانمان هاتبوو.
هەر کە هاتینە دەرەوە لە کایەنەکەدا یەکسەر لوتمان تەقی بە لوتی کوڕەکانەوە. ئەوانیش وەکو ئێمە لە سەرمادا هەڵدەلەرزین. من و براکانم بە ڕاکردن چووینەوە بۆ ماڵەوە و لە موبەقەکەماندا تۆزێک گەرممان بووەوە.
بڕوابکەن کـە گەیشتینە ماڵەوە، هێشتا کەس لـە ماڵەوە بەخەبەر نەبـوو. هەموویان نوستبوون، کاتژمێر چوار و نیـوی بەیانی بوو. بەڵام زۆری پێنەچوو زەنگی کاتژمێرەکەی باجی توبا لێیدا.

باجی توبا دەبوایە بەیانیان زوو هەستایە و مەڕومالاتی بدۆشیایە. ئەو پێش ئەوەی بڕوات بۆ گەورەکە، کولیچە و شیری گەرمی داینێ. ئەی خوایە کە تامی ئەو کولیچانە خۆشبوو لە ناو دەمدا. بە پەلە چوومە ناو جێگەکەی خۆمەوە و تا درەنگ نوستم. من لەو بڕوایەدام ئەو کەسەی یەکەمجار قەرەوێڵەی درووستکردووە، دەبێت کەسێکی ئێجگار زیرەک و لێهاتوو و بەهرەمەند بوو بێت. چونکە بـە تەنها لەسەر قەرەوێڵە نەرم و شلەکەی خـۆت خەوی باشت لێدەکەوێت.



## من و هاوبەش نیازمان بوو ڕابکەین

بەلامەوە هیچ شتێک لەوە خۆشترنەبوو کاتێک من و هاوبەش پێکەوە یاریماندەکرد. من و هاوبەش کۆمەڵێک یاری سەیرمان هەبوو کـە هەر خۆمان دامانهێنابوو. هەر بـە تەنها خۆمان لێی تێدەگەشتین. جاری وا هەبوو ئێمە واخۆمان دانابوو کە دوو ژنین سەر لە یەکتری دەدەین.

هاوبەش ناوی خۆی گۆڕیبوو بە خورشی خان و منیش بە ڕوناک خان. هاوبەش ماقوڵانە خۆی نیشاندەدا، کاتێک ئەو خۆی کردبوو بە خورشی خان. بە زمانێکی شیرین قسەیدەکرد لەگەڵمدا. جاری وا هەبوو یاری واماندەکرد کە خورشی خان و ڕووناک خان لەگەڵ یەکتریدا ناکۆکبوون. هاوبەش بەمن دەڵێت: "ڕووناک خان. خۆت و منداڵە ناشیرینەکانت بـڕۆنەوە بـۆ ماڵـی خـــۆتان."



هـاوبەش بـــە بوکەشووشەکانی منی دەوت منـــداڵـە ناشیرینەکان.

منیش پێموت: "من لەو بڕوایەدام کـە منداڵەکانی خورشی خـان خۆیان ناشیرینن، نەک منداڵەکانی من. با ئەوان بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆیان."

بەڵام دوایی ئاشت دەبوینەوە و واخۆمان دەردەخست، کە پێکەوە دەچین بۆ بازاڕ و قووماشی قەیفە و ئاوریشم و کەتان دەکڕین. ئێمە هەردووکمان زۆر دەترساین کـە شڤان و شاد گوێیان لێمان بێت. چونکە ئەگەر ئەوان بیانزانیایە ئەوا گاڵتەی زۆریان پێدەکردین. ئەگەر باپیرە گوێی لێمان بوایە قەیدی نەدەکرد، چونکە ئەو خۆی هەندێکجار لـە یارییەکانماندا بەشداریدەکـرد. جاروبار بـە پارەی درووستکراو شتمان لە باپیرە دەکڕی.

زۆربەی جـار من و هاوبەش ڕۆژنامەمان بۆ باپیرە دەخوێندەوە. کاتێک باپیرە منداڵێکی بچکۆلانە بووە دایک و باوکی مردووە. باپیرە لەلای خزمەکانی ماوەتەوە. بەڵام ئەوان زۆر خـراپ بوون لەگەڵیدا و ئازاریان زۆر داوە. هەر بە منداڵی ئیشی قورس و گرانیان پێکـردووە و زۆریان لـە باپیرە داوە و نان و خـۆراکیشیان کـەم داوەتێ. زۆربەی شەو باپیرە بێ شێو سەری ناوەتەوە. لە کۆتایدا باپیرە بەرگەی لێدان و برسییەتی نەگرتووە و ناچار بووە لە دەست خزمەکانـی هەڵبێت. باپیرە زۆر بەسەرهاتـی سەیر و خـۆش و سەرنجڕاکێشی لەلابوو، کە هەرگیز بە من باسناکرێن.

دوایی باپیره بەختێکی باشی هەبووە، چونکە چۆتە لای خێزانێکی دڵنەرم و پڕ بە بەزەیی. ئەوان وەکو کوڕی خۆیان تەماشایان کردووە.
ڕۆژێکی باراناوی بوو کاتێک من و هاوبەش وەکو جاران لەلای باپیرە دانیشتبوین و ڕۆژنامەکەمان بۆ دەخوێندەوە. هاوبەش بە باپیرەی وت:
"باپیرە توخودا بەسەرهاتی ڕاکردنەکەتمان بۆ بگێڕەوە."
"کچینە خۆ من سەد جار پێشتر ئەم باسەم بۆ گێڕاونەتەوە."
بەڵام ئێمە سووربووین لەسەر ئەوەی کە باپیرە جارێکی تریش ئەو بەسەرهاتەمان بۆ بگێڕێتەوە، ئەویش بەسەرهاتەکەی جارێکیتر بۆ گێڕاینەوە. لە دواییدا هاوبەش بەمنی وت:
"لەوانەیە لە هەڵهاتن خۆشتر نەبێت. من حەزدەکەم هەڵبێم."
منیش پێموت: "خۆ تۆ دەبێت لە پێش هەموو شتێکدا، خێزانێکی زۆردارت هەبێت لە دەست ئەوان ڕابکەیت."
هاوبەش پێی وتم:
"سارا گیان ، مەرج نییە وا بێت. بە هەرحاڵ ئێمە دەتوانین تەنها چەند کاتژمێرێک لە ماڵ هەڵبێین. دوایی دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە."
منیش وتم: "ئەگەر وایە با هەڵبێین."
هاوبەش پرسیاری لە باپیرە کرد: "باپیرە تۆ لەو بڕوایەدای کە ئێمە توانای ئەوەمان هەبێت هەڵبێین؟"

باپیرەش باوەڕی وابوو کە ئێمە لە تواناماندا هەبوو ماوەیەکی کورت هەڵبێین. ئێمەش بڕیارماندا کە بۆ شەوەکەی ڕابکەین ئەو دەمە ماڵەوەمان هەموویـان نووستوون. بە باپیرەمان وت دەبێت ئەو بەڵێنمان بـداتێ کـە نهێنییەکەمان بۆ کەسێکـیتر نەدرکێنێت. باپیرەش بەڵێنی داینێ کە نهێنییەکەمان بۆ کەسێکی تر ئاشکرا نەکات. من خەوم قورسە و هەمیشە بەلامەوە زۆر سەخت بوو خۆم خەبەرم بێتەوە. لەبەر ئەوە من خۆم نەمدەتوانی ئەو کاتە بە ئاگابم کە من و هاوبەش دامانئابوو هەڵبێین. هاوبەش وتی:

"سارا گیان تۆ بنوو هیچ خەمت نەبێت. بەلام دەبێت کاتی نووستن پەتێک ببەستیت بە پەنجە گەورەی پێتەوە لە پەنجەرەکەوە پەتەکە شۆڕبکەیتە خوارەوە. من کە هاتم پەتەکە ڕادەکێشم و تۆش بەو جۆرە خەبەرت دەبێتەوە."

هاوبەش وتی کـە ئەو دڕک و داڵ دەخاتە نـاو جێگەکەیەوە بۆ ئەوەی دڕک و داڵەکـە خەوی لێبزڕێنێت تا ئەو کاتژمێرەی کـە دامانئابوو پێکەوە ڕابکەین. لە باپیرەمان پرسی چی لەگەڵ خۆماندا ببەین. ئەویش وتی: "تۆزێک خواردن و کەمێک پارەتان پێبێت باشە."

ئێمە وابڕیارماندابوو کە هەمان شەو ڕابکەین. لەبەرئەوە ماخۆلان کەوتبووە گیانمانەوە. من چووم بۆلای دایکم داوام لێکرد کە چەند نانە چەورەیەکم بۆ سوربکاتەوە، ئەویش پێی وتم: "هەر لە ئێستەوە

برسیتە! خۆ ئەوەندە نابێت ئێمە نانی ئێوارەمان خواردووە."
من نەمدەتوانی ڕاستییەکە بۆ دایکم بگێڕمەوە. کە نیازم چی بووە و ئەو نانە چەورانەم بۆچی بووە. لەبەرئەوە بێدەنگبووم و وەڵامی دایکمم نەدایەوە. دوایی لە دەخیلەکەمدا دوو سەد فلسم دەرهێنا و خستمە ژێر پشتییەکەمەوە. پاشان گەڕام بە شوێن پەتێکی درێژدا بۆئەوەی پەنجەی پێمی پێ ببەستم. سەر لەئێوارە هەمووومان یاری فوتبۆڵینمانکرد تا کاتی نووستنمان هات، من و هاوبەش چاوێکمان لە یەکتری داگرت و بە چپە بە یەکتریمان وت: "کاتژمێر دەو نیو."
کاتی نووستن کـە شەوشادمان لە یەکتری کـرد. من توند باوەشم کـرد بە دایکم و باوکمدا. چونکـە من لەو باوەڕە دابووم کـە تا ماوەیەکی زۆر ئەوان نەبینمەوە. کاتێک دایکم پێی وتم کە بەیانی پێکەوە توتڕک کۆ دەکەینەوە، تێر بەزەییم بە دایکمدا هاتەوە. کە بەیانی داهات کچە بچکۆلەکەی لەماڵەوە نابینێت. دواییش چوومە ژوورەکەم و پەنجە گەورەی قاچم بە
پەتێکەوە بەستەوە و
لە پەنجەرەکەمەوە پەتەکەم
شۆڕکردەوە خوارەوە و
چوومە ناو جێگەکەمەوە.



حەزمدەکرد خێرا بنووم، بۆ ئەوەی هیلاک نەبم لە کاتی هەڵهاتنەکەماندا.

من پیشەم وابوو هەر کە سەرم دەنایە سەر سەرین ئیتر یەکسەر خەوم لێدەکەوت. بەڵام ئەو شەوە خەوم لێنەدەکەوت. لە جێگەکەمدا هەر تەپاو تلم دەدا و وێنەی دایکم و باوکمم دەهاتەوە پێشچاو. ئاخۆ ئەوان بەیانی چەند خەفەت بخۆن کاتێک کچەکەیان لەماڵەوە نابینن. زۆر بەزەییم بە دایکم و باوکمدا هاتەوە، دەستمکرد بە گریان. زۆر زۆر گریام. ئیتر دواییەکەی نووستم.

کاتێک کە خەبەرم بووەوە هەستمکرد یەکێک پەنجەی پێم ڕادەکێشێت. لە سەرەتادا نەمدەزانی چی ڕویداوە. بەڵام کە بە تەواوەتی خەبەرم بووەوە، وامزانی هاوبەشە و پەتەکەی پێم ڕادەکێشێت، هاوارمکرد.

"ڕاوەستە هاوبەش وا هاتم."



خێرا لە جێگەکەم بەرزبوومەوە و بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشتم. کە سەیرمکرد ڕۆژ بووەتەوە. شڤان لە نزیک پەنجەرەکەمەوە وەستاوە و پەتەکە ڕادەکێشێت.

خوایە کە تووڕە بووم و قیژاندم: "ئای.. ئای..، شڤان پەتەکە ڕامەکێشە."

شڤان هەر پێدەکەنی و پەتەکەی زیاتر ڕادەکێشا. منیش هەتا پێم کرا قیژاندم:

"شڤان وازبێنە! پەتەکە ڕامەکێشە"

"سارا گیان، پێم بڵێ بۆ ئەو پەتە ڕانەکێشم."

"لەبەرئەوەی پەتەکە بە پەنجە گەورەی قاچمەوە بەستراوە."

شڤان دایە قاقای پێکەنین و وتی:

"ئەها.. ئێستا دەزانم کە قولاپەکەم ماسییەکی باشی پێوە بووە."

دوایی شڤان دەیویست بزانێت بۆچی من ئەو پەتەم بەستووە بە پەنجە گەورەمەوە. بەڵام من هیچم پێنەوت. یەکسەر بە ڕاکردن بە قادرمەکاندا هاتمە خوارەوە بەرەو ماڵی هاوبەش ڕۆیشتم.

من لەو بڕوایەدا بووم کە هاوبەش منی بە جێهێشتووە و خۆی بە تەنها ڕایکردووە. هانا لە سەر پێپلیکانەکان دانیشتبوو. یاری لەگەڵ پشیلەکەیان دەکرد. بە شڵەژاوی لە هانام پرسی:

"دەزانیت هاوبەش لە کوێیە؟"

"نووستووە."

بە پێپلیکانەکاندا سەرکەوتم بۆ ژوورەکەی هاوبەش و هانا.

هاوبەش لەسەر جێگەکەی پرخەی دەهات. من ویستم پەتەکەم ببەستم بە پەنجەگەورەی قاچی هاوبەشەوە کەچی یەکسەر خەبەری بووەوە و پێی وتم: "ئۆی.. ئۆی...، سارا، ئەرێ کاتژمێر چەندە؟" کاتێک کە من وەڵامم دایەوە کە کاتژمێر هەشتی بەیانییە. ماوەیەکی زۆر هاوبەش بە بێدەنگی دانیشت لەسەر جێگەکەی و دوایی وتی:

"ئەوانەی کە شەو خەویان لێناکەوێت، با درک و داڵ و پووش بخەنە ناو پێخەفەکانیانەوە، ئەوسا بۆیاندەردەکەوێت کە چۆن زوو خەویان لێدەکەوێت."

دوایی چووین بۆلای باپیرە بۆ ئەوەی ڕۆژنامەی بۆ بخوێنینەوە. کاتێک باپیرە بینینی ئەو تۆزێک پەشۆکا و پێی وتین:

"ئەوە چیە؟ دەڵێی ڕاتان نەکردووە؟"

ئێمەش وەڵامی باپیرەمان دایەوە:

"شەوێکیتر هەڵدێین."

# ماڵە باجێنە

ڕۆژانە من و هانا و هاوبەش پێکەوە لە کایەنەکەماندا یاریماندەکرد تا تاقەتمان دەچوو.

شڤان و شاد و هەستیار هەموو بەیانییەک لێمان وندەبوون، ئێمەش نەماندەزانی بۆکوێ دەچن. لە سەرەتاوە بە لامانەوە گرنگ نەبوو ئەوان بە چییەوە خەریکبوون. چونکە ئێمە هەرسێکمان یاری خۆشمان لەگەڵ یەکتریدەکرد.

لە نزیکی لەوەڕگا پەرژینکراوەکەی پشت ماڵی هەستیار. هەندێک بەردی گەورە و چەند گرد و ئەشکەوتی بچکۆلانەی لێبوو. من و هانا و هاوبەش ڕۆیشتین لەوێ یاری بکەین. هانا وتی با ئەشکەوتێک بکەین بە خانووی ماڵەباجێنە. ئێمەش ئەشکەوتێکمان هەڵبژارد کە کەم تا زۆر لە ژوورێکی بچکۆلانە دەچوو.

ئای خودایە گیان کە بەیەکەوە کاتێکی خۆشمان بەسەربرد. جێگەکەمان ئەوەندە جوان بوو. کە هەرگیز ئێمە شوێنی وا خۆشمان بە خەویش نەبینی بوو.

دایکم مۆڵەتیدام کە دوو بەڕە لەگەڵ خۆم بهێنم. منیش بەڕەکانم جوان لەسەر بەردەکان ڕاخست. دوایش پاکەتی بەتاڵی شەکرمان لەملاولادا دانا. کارتۆنێکی چوار گۆشەشمان دانا لە ناوەڕاستدا،

دەوری مێزێکی دەبینی. ئێمەش شتی زۆرمان لە سەر کارتۆنەکە دانا، لە پێشدا هانا ڕەفتەیەکی چوارگۆشەی لە سەر کارتۆنەکە دانا هەر وەکـو سفرەی سەرمێز. هەر یەکەشمان لە سەر کورسییەک دانیشتبووین. منیش دەستە پەرداخ و کوپی قاوەی منداڵانەکەی خۆمم لە سەر مێزەکە دانا. هاناش سوراحی و پەرداخەکانی خۆی دوابەدوای من لە سەر مێزەکە دانا.

دوایش چووین هەندێک گوڵی بۆنخۆشمان کۆکردەوە، گوڵەکانیشمان خستە نـاو گوڵدانێکەوە و لە سەر مێزەکـە دامانان. ئەی خـودایە گوڵەکان چەند جوان و بۆن خۆش بوون.

باجی توبا ئیشکەرەکەمان سەر لە بەیانییەکەی کێکی درووستکرد. منیش بە هەلمزانی هەندێک کولیچە و چەند پارچە کێکێک لەگەڵ خۆم بهێنم.



ئیتر بۆخۆمان لـه دەوری مێـزە کارتۆنەکـە دانیشـتین و وا هەستماندەکرد چا لە کوپە بچکۆلانەکاندا دەخۆینەوە. هاناش شووشە شەربەتەکەی خـۆی هێنا و دەستمانکرد بـە شەربەت خواردنەوە. دوایی هەستاین و چووین بۆ توترِک کۆکردنەوە، کە زۆر دوور نەبوو لێمانەوە.



هانا لە یاری ماڵە باجێنەکەدا خۆیکردبوو بە ژنی ماڵ و ناوی خۆشی نابوو فاتمەخان. منیش کارەکەر بووم و ناوم باجی چیمەن بوو هاوبەشیش منداڵی فاتمەخان بوو. دوایی هانا لە سەر قوماشێکی سپی خەریکی پەنیر دروستکردن بوو. هانا کە ناوی فاتمە خان بوو بە منی وت: "خودا بەزیادی نەکات. نازانم بۆ باجی چیمەن قەت فێری دروستکردنی پەنیر نابێت."

منیش وەڵامم دایەوە: "فاتمە خان با بۆ خۆی پەنیر درووستبکات، من نامەوێت فێری پەنیر درووستکردن ببم."

هەر لەو کاتەدا کە من ئەم قسەیەمکرد، لە پشت بەردە گەورەکانەوە دووگوڵە زەردەکەی شادی برامم بینی. منیش یەکسەر بە چپە بە هانا و هاوبەشم وت:

"ئاگاتان لە خۆتان بێت کورەکان بە دزییەوە چاودێریمان دەکەن."

دوایی هاوارمان لێکردن: "هاهاها، باشتر وایە خۆتان دەربخەن."



به فرکەیەک شڤان و شاد و هەستیار گەیشتنە لامان. یەکسەر کەوتنە گاڵتە پێکردنمان. دەمیان لار دەکردەوە و لاساییان دەکردینەوە و دەیان قیژاند:

"باجی چیمەن! نازانێت پەنیری کوردی درووستبکات هاهاها."

ئەو ڕۆژە کوڕەکان دەستبەردارمان نەبوون و گاڵتەی زۆریان پێکردین و ئێمەش ناچار بووین واز لەیاری ماڵەباجێنە بهێنین و لەگەڵیاندا فوتبۆڵێن بکەین. هەرچەندە جاروبار شڤان پێی ڕادەبواردین و بە زەردەخەنەوە پێی دەوتین:

"باجی چیمەن خێرا ڕابکە ، فاتمەخان زوو باز بدە."

# کوڕ ناتوانێت نهێنی بپارێزێت

ڕۆژی دوایی هەرکە نانی بەیانیمان خوارد. شڤان و شاد و هەستیار ونبوون.

پێش نیوەڕۆ بوو، من و هانا و هاوبەش ماڵەباجێنەمان دەکرد. وردە وردە خەریک بوو تاقەتمان لە یاری ماڵەباجێنە دەچوو.

کوڕەکانمان هاتەوە یاد. ئاخۆ ئەوان لەکوێ بن و خەریکی چیبن. ئێمە پێشتر بیرمان لەوان نەدەکردەوە. ماوەی هەفتەیەک دەبوو کە ئەوانمان بەس دەمەو ئێواران دەبینی. ئەو کاتانەی کە یاری فوتبۆڵێنمان پێکەوە دەکرد. هانا پێی وتین:

"با بە دزییەوە دوایان بکەوین بزانین ئەوان خەریکی چین."

زۆر باشە من و هاوبەش وەڵامی هانامان دایەوە:

"زۆر باشە بە نهێنی دوایاندەکەوین. دەبێت بزانین ئەوان لەکوێن و بە چییەوە خەریکن."

کە بووبە نیوەڕۆ، وەکو پاسەوان لە سەر پێپلیکانەکان دانیشتبووین. لە پێشدا شڤان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. زۆری پێنەچوو شادیش هاتەوە، تۆزێک دواتر هەستیاریش گەڕایەوە.

هەرسێکیان لـە شوێنی جیاجیاوە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە. ئیتر ئێمە تێگەیشتین کە ئەوان نهێنییەکیان هەیە و نایانەوێت بە ئێمەی بڵێن.

ئەگەر وا نەبوایە ئەوان پێکەوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە.
ئێمە بوکەکانی خۆمانمان پێبوو لە سەر پێپلیکانەکان دانیشتبووین. خۆمان واپیشاندەدا کە گوێ بە کوڕەکان نادەین.
ئەوەش بۆ ئەوە بوو، کە کوڕەکان گومانمان لێنەکەن، کە ئێمە چاودێریان دەکەین. ئێمە یاری خۆمان لەگەڵ بوکەکانماندا دەکرد و هیچ قسەمان لەگەڵ کوڕەکان نەکرد کاتێک گەڕانەوە بۆ ماڵەوە.
دوایی هەمووومان چووین بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ. هەر کە نانەکەمان خوارد پەلەی ئەوەمان بوو خێرا بچینەوە سەر پێپلیکانەکان. تۆزێکی پێچوو شڤانمان بینی لە ماڵ چووە دەرەوە. ئێمە وامان پیشاندەدا کە خەریکی یاری خۆمانین لەگەڵ بوکەکانماندا. شڤان لەگەڵ ڕۆیشتندا تۆزێک یاری لەگەڵ پشیلەکەماندا کرد و دەستی هێنا بە سەریدا.
هەرکە شڤان لە ماڵەوە چووە دەرەوە، ئێمەش بە فڕکان چووینە بەرپەنجەرەکە و لەوێوە باش شڤانمان دەبینی. ئەو بە گومانەوە دەیڕوانییە دەوروبەری خۆی. دوایی دەستیکرد بە ڕاکردن و بەناو مۆردەکاندا تێپەری و بازێکی دا بەسەر دیوارە بەردینەکەدا و ئیتر لەو شوێنەوە ئێمە شڤانمان لێ ونبوو.
زۆری پێنەچوو شادیش بە هەمانشێوەی شڤان لە پشتی دیوارە بەردینەکەوە ونبوو.

هانا وتی: "دەست دەنێم بە قورئاندا هەر ئێستا هەستیاریش لە ماڵ دەردەچێت. وەرن با بڕۆین لە نێو مۆردەکاندا خۆمان بشارینەوە بزانین ئەو بۆکوێ دەچێت."

بەپەلە چووین خۆمان لە نێو مۆردەکاندا شاردەوە و بێدەنگ بوین. زۆری نەبرد هەستیار هات و ئەوەندە لە نزیکمانەوە ڕایکرد، ئەگەر بمانویستایە، دەمانتوانی قاچی بگرین. ئێمەش بە دزییەوە دوایکەوتین. لە پشتی باخچەکەی خۆمانەوە یەک مێرگی پەرژینکراوی لێبوو. لەو مێرگەدا هەموو جۆرە شەخەڵێکی بەرزی چڕی تێدا سەوز ببوو. هەروەها پڕبوو لە داری توو و هەنار و داری میوەی تر.

باوکم نیازی هەبوو هەموو ئەو شەخەڵانە ببڕێتەوە و تاوەکو لەوەڕگایەکی چاکی لێدروستبکات بۆ مانگاکانمان. بەڵام من حەزم نە دەکـرد باوکم شەخەڵەکان ببڕێتەوە چـونکە دەیان جێگەی خۆشاردنەوەی چاکی تێدابوو. ماوەیەک بـە دزییەوە دوای هەستیار کـەوتین. ئەو چـووە ناو دارستانێکی بچکۆلانەی چڕەوە. لەپڕ لە چاو تروکاندنێکدا ئەومان لێ ونبوو. زۆر لـەو ناوەدا گـەڕاین بە شـوێن هەستیاردا بەڵام نەمانـدۆزییەوە. ئێمە دڵنیابووین کـە کوڕەکان لە مێرگەکەدا بوون بەڵام ئەوانمان بۆ نە دەدۆزرایەوە.

لەپڕ هانا پێی وتین: "دەزانن چی بکەین باشە؟"

"چی"

"با بچین بازە بهێنین. بازە هەر بە بۆن کوڕەکان دەۆزێتەوە."
من و هاوبەش هەر هەمان بیرۆکەی هاناامان هەبوو. هێنانی بازە، پێشنیارێکی چاک بوو. بە ڕاکردن گەڕاینەوە بۆ ماڵی هەستیار و داوامان لە دایکی کرد ئیزنمان بدات بازە لەگەڵ خۆمان ببەینە دەرەوە. دایکی هەستیاریش ڕێگای داین و بازەش زۆر حەزی لە گەڕان و چوونە دەرەوە بوو. ئەو هەر لە خۆشیاندا هەڵدەبەزییەوە و دەوەڕی. ئێمەش پێمان وت:
"بازە برۆ هەستیارمان بۆ بدۆزەرەوە؟"
بازە بەناو مۆردەکاندا دەڕۆیشت و ئێمەش بەدوایەوە بووین و خێرا بە ناو شەخەڵەکاندا دەڕۆیشتین. زۆری پێنەچوو بازە کوڕەکانی بۆ دۆزینەوە.
کە بازە هەستیاری بینی. خێرا چوو بۆ لای و کلکی بۆ دەلەقاند. شڤان و شادیش بە حەپەساوی سەیریاندەکردین. ئەوان بە لایانەوە سەیر بوو کە ئێمە توانیمان پەردە لە ڕووی نهێنییەکەیان لابدەین.



نهێنییەکەش بریتی بوو لە کوخێک کە درووستیانکردبوو لە مێرگەکەدا.
"هاهاها، چۆن سەرتان سوڕماوە، چۆن سەرسوڕمانێک!"
بە کوڕەکانمان وت پێویست ناکات، ئێوە نهێنییەکانی خۆتانمان لێبشارنەوە. چونکە ئێمە یەک لەدوای یەک پەردە لە ڕوویان لادەدەین.
بازە دڵی خۆشبوو هەر بازی دەدا، لەو بڕوایەدا بوو کە شتێکی باشی کردووە. ئێمەش بڕیارماندا کە گەڕاینەوە ماڵەوە پلە گۆشتێک بەخشیشی بدەینێ.
کوڕەکان کوخێکیان درووستکردبوو. تەختەیان بە بزمار بە چواردەوریدا داکوتابوو. کوخەکە بە شێوەی چوارگۆشە درووستکرابوو دەوروبەرەکەشی بە توڵی ناسک پەرژین کرابوو. شڤان وتی بۆیە ئەو تولانەیان بەکارهێناوە چونکە تەختەیان کەم بووە و بەشی درووستکردنی کوخەکەیانی نەکردووە. ئەگەر تەختەیان هەبوایە ئەوا ئەوان بنمیچیشیان بۆ کوخەکە درووستدەکرد. لەجیاتیدا بەتانییەکی کۆنیان داکوتابوو.



ئەو بەتانییەی کـە کاتی خۆی بـە زستانان دەماندا بـە پشتی ئەسپەرەشدا بۆ ئەوەی سەرمای نەبێت. شڤان روویکردە شاد و هەستیار و وتی: "رێگا بدەین کچەکان یاریمان لەگەڵ بکەن."
ئەوانیش وەلامیان دایەوە: "خۆت دەزانی؟"
ئەوان رای شڤانیان بەلاوە گرنگ بوو. شڤانیش وتی کچەکان بۆیان هەیە ئەمرۆ یاریمان لەگەڵ بکەن.
دوایـی دەستمانکرد بـە یاریکردن کـە ئێمە هیندی سووری ئەمـریکین و شڤان کوێخامان بـوو ناوی خۆی نابوو پڵنگی بەهەڵمەت. شادیش ناوی ئاسکی خێرا بوو و هەستیاریش بازی فریو. هانا ناوی قیژەی ورچ و هاوبەشیش ناوی گورکی زەرد و منیش ناوم مام رێوی فێڵبازبوو.
من حەزمدەکرد ناوێکی ترم بۆ خۆم هەڵبژاردایە بەلام شڤانی برام رای لەسەر نەبوو. ئەو وتی سارا هەر دەبێت ناوی مام رێوی فێلباز بێت. چونکە هەر لە مام رێوی فیلباز دەچێت.
ێمە لە نێو کوخەکەماندا ئاگرمان نەبوو، بەلام وامان دەردەخست کە هەمانە و لە دەوری ئاگرەکە کۆبووینەتەوە و شڤانی کوێخامان نێرگەلەی ئاشتی بە دەمەوە بوو.
کورەکـان تیروکەوانیان دروستکـرد بۆ خۆیان و هەروەها بـۆ ئێمەش.

شڤان وتی لە دەوروبەری مێرگەکەدا خێلێکی دوژمنی لێدەژی ناوی کۆمانچەرە. ئەم خێڵە زۆرترسناک و شەڕانین. دەبێت سەربکەوین بە سەریاندا ئەگینا ژیانــی خێڵەکەمــان دەکەوێتە مەترسییەوە. ئێمەش تیروکەوانەکانمان هەڵگرت بە قیژە و هاوارکردن بە ناو مێرگەکەدا دەڕۆیشتین.

مانگاکانمان لە نێو مێرگەکەدا دەلەوەڕان. شڤان ئیشارەتی کرد بۆ مانگاکان و پێی وتین:

"ئەمانەن کۆمانچەرەکان. خۆی هەر بە ناوەکەیاندا دەردەکەوێت کە دوژمنمانن."

ئای کە کۆمانچەرەکان لە ترساندا ڕایاندەکرد و ئێمەش ڕاماندەکرد بە دوایاندا. شڤان بە زمانی هیندییە سوورەکان هاواریدەکرد. من بۆ شڤانم دەڕوانی و لەو بڕوایەدا نەبووم کە مانگاکان لە قیژە قیژ و زمانە هیندییەکەی شڤانی برام هیچ تێگەشتبن.



# دەوامی قوتابخانە دەستی پێکردەوە

کاتێک پشووی هاوین دەستیپێکرد، من حەزمدەکرد قوتابخانە زوو دەست پێبکاتەوە. شڤان دەیوت. من پەیامێک دەنێرم بۆ پادشا. داوای لێدەکەم کە هەموو قوتابخانەکانی وڵات دابخات. من هیوادارم پادشا بە قسەی شڤانی برام نەکات. چونکە من حەزدەکەم بڕۆمەوە بۆ قوتابخانە. مامۆستاکەشم زۆر خۆشدەوێت، هاوەڵەکانی قوتابخانە و پەرتووکەکانیشم خۆشدەوێت. بەرگی جوان دەگرمە پەرتووکەکانم و ناوی خۆمی لەسەر دەنووسم.

شڤان و شاد ئەگەر ناچارنەبن بەرگ ناگرنە پەرتووکەکانیان. ئەگەر بێت و دایکم و باوکم و مامۆستاکەمان پێیان نەڵێن ئەوان بەرگ ناگرنە پەرتووکەکانیان. کوڕەکان بە ئەنقەست کتێبەکانیان ڕەش دەکەنەوە. شڤان وێنەی پێکەنیناوی درووستدەکات و بە کەتیرە دەینووسێنێت بەپەرەی پەرتووکی جوگرافیاوە. لە پەرتووکەکەی شڤاندا وێنەی کابرایەکی چینی تێدایە کە خەریکی چەڵتووک وەشاندنە.



شڤان بە جۆرێک وێنەکەی گۆڕیوە. بە دەموچاو پیاوێکی ئەورووپیە و بە جلەکانیدا لە جوتیارێکی چینی دەچێت.

ئێمە منداڵانی ئاوایی، هەموو بەیانییەک پێکەوە، کاتژمێر حەوت و نیو لە ماڵ دەردەچووین و سەعات هەشت دەگەیشتینە قوتابخانە.

ئێمە شیر و نانەچەورەمان لەگەڵ خۆمان دەبرد بۆ قوتابخانە.

لەکاتی پشوودانی سەر لە بەیانیاندا نانە چەورەکانمان دەخوارد.

هەندێکجار شڤان و شاد و هەستیار پێش ئەوەی بگەنە قوتابخانە هەر بەرێگاوە نانەچەورەکانی خۆیان دەخوارد. شڤان دەیوت:

"من هیچ جیاوازی نابینم ئەگەر بێت و نانەچەورەکان لە ناو سکمدابن یاخود لە ناو جانتاکەمدا بن."

مامۆستا لە نهۆمی سەرەوەی قوتابخانەکەمان دەژیا. لەوێدا ژوورێکی خۆشی هەبوو لەگەڵ پیانۆیەکدا. هەروەها کتێبێکی زۆر و موبەقێکی نایاب.

ئێمە زۆر جار پەرتووکمان لە مامۆستا قەرز دەکرد. جاروباریش داری سووتاندنمان بۆ دەهێنا. هەندێکجاریش ئەو بانگهێشتی دەکردین و چکلێتی دەداینێ.

جارێکیان کە گەیشتینە قوتابخانە مامۆستا نەخۆش بوو. ئەو ڕۆژەش قوتابخانەمان نەبوو. هەموو منداڵەکانی گەورەدێ زانیبوویان کە قوتابخانە نییە ئێمە نەبێت. چونکە لە ئاواییەکەماندا تەلەفۆنمان نەبوو. ئەو ڕۆژە نەماندەزانی چی بکەین. هۆڵی قوتابخانەکە داخرابوو. مامۆستا و قوتابی لێ نەبوو. دوای هەندێک چاوەڕوانی بە پێپلیکانەکاندا

چووینە سەرەوە و لە دەرگای مامۆستاکەماندا. مامۆستاکەمان بانگی لێکردین: "وەرنە ژوورەوە"

کە چووینە ژوورەوە مامۆستاکەمان لە جێگەدا کەوتبوو. خۆی دەبوایە خزمێکی بهاتایە و خزمەتی بکردایە. بەڵام ئەو ڕۆژە خزمەکەی نەهاتبوو. پێمانوت ئێمە لە جیاتی خزمەکەی خزمەتی دەکەین. ئێمە زۆر حەزماندەکرد یارمەتی مامۆستاکەمان بدەین.

کوڕەکان ڕایانکرد داری سوتاندنیان هێنا و هاناش تەباخەکەی داگیرساند. ئاوی خستە ناو مەنجەڵێکەوە و داینا لەسەر چاوی تەباخەکە. منیش ماڵەکەم بۆ پاککردەوە و پشتییەکانم تەکاند. دوایی نان و چای بەیانیمان بۆ مامۆستا ئامادەکرد.

مامۆستا پێی وتین، کە ئەو زۆر حەزی لە گۆشتاوە. ئەو پێی وتین کە ئێمە چێشتی گۆشتاوی بۆ لێبنێین بە مەرجێک کە خۆی ڕێنمایمان بکات چۆن گۆشتاوەکە لێبنێین. هانا پێی وتین: "با دەستپێبکەین. ئەگەر گۆشتاو دەرنەچێت لەوانەیە هەر شتێکی خۆشی لێدەربچێت." بەڵام بە هەرحاڵ گۆشتاوێکی خراپی لێدەرنەچوو. ئێستا دەزانم چۆن گۆشتاو لێدەنرێت. ئیتر کاتێک گەورە بووم پێویست ناکات فێری لێنانی بم.

گۆشتاوەکەش زۆر خۆش دەرچوو. مامۆستا داوای لێکردین کە ئێمەش لێیبخۆین.

ئێمەش لێمانخوارد و دوایش هانا و هاوبەش خەریکی قاپ شتن بوون و منیش قاپە شۆراوەکانم وشکدەکردەوە. لەبەرئەوەی کوڕان هیچ کارێکــی باشتریان لێنەدەوەشـایەوە. هەموو کاتەکە ئـەوان دانشتبوون پەرتووکیان دەخوێندەوە.

تاکاتی کۆتایی قوتابخانە ئێمە لە ماڵی مامۆستا ماینەوە. کاتێک کە لە مامۆستامان پرسی ئایا ڕۆژی دوایی قوتابخانە هەیە. ئەویش وەڵامی داینەوە نەخێر.

ئێمە پێمانوت ئەگەر مامۆستا حەز بکات بەیانیش دێینەوە بۆ لای. مامۆستاکەمان پێی وتین کە ئەو زۆر دڵخۆش دەبێت ئەگەر هات و بەیانی سەری لێبدەین.

ڕۆژی دوایی کە چووین بۆ لای مامۆستا تەنها من و هانا و هاوبەش بووین. مامۆستاکەمان لە جێگەدا کەوتبوو.

ئێمە چووینە بن باڵییەوە لەسەر کورسییە جوڵانەییەکەی دامانناو. دوایی بە ڕێکوپێکی جێگەی نووستنەکەمان بۆ ڕێکخست، کاتێک کە مامۆستا پاڵکەوتەوە، جێگەی نووستنەکەی ئەوەندە خۆشبوو کە هەر لەجێگەی نوستنی شازادە دەچوو.

دوایی شۆربای نیسکێنەمان بۆ لێنا. مامۆستا زۆر حەزی لە شۆربای نیسکێنە بوو. دوای نیسک خواردنیش کوپێک قاوە و کێکی تازەمان لەسەر سینییەک بۆ دانا. ئەو کێکەمان لە ماڵەوە بۆ هێنا بوو.

بەڵام بۆ نەگبەتی ئێمە ڕۆژی دوایی مامۆستا چاکبووەوە. ئەگەر وانەبوایە، ئەوا بەلای کەمەوە ئێمە فێری لێنانی چەند چێشتێکی تریش دەبووین.

ڕۆژ لە پایز و زستاندا زوو تاریک دەبێت. کە بەیانیان لەماڵەوە دەردەچین دنیا تاریکە. هەروەها کاتێک کە لە قوتابخانە دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. سەرانسەری ڕێگاکە هەر دارستانبوو. بە تاریکی زۆر ترسناکە کە بە تەنها بڕۆی بەو ڕێگایەدا. بەڵام کاتێک ئێمە شەش منداڵ بووین ترسی زۆرمان نەبوو لە چوون بۆ قوتابخانە و گەڕانەوەماندا. شڤان دەیویست ئێمە ترس و گومانمان لەلا درووست ببێت. ئەو پێی دەوتین کە دارستانەکە پڕە لە دێو و درنج و خێو و جنۆکە. لەوانەیە وابێت وەکو شڤانی برام دەیڵێت بەڵام من تا ئێستا هیچم لەمانە بە چاوی خۆم نەبینیوە.

جاری وا هەیە ئەستێرەکان دەدرەوشێنەوە، کاتێک ئێواران دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە.

شڤان دەڵێت (٢٥٠٠٠٥٤) ئەستێرە بە ئاسمانەوەیە. ئەو دەشڵێت کە ئەو ناوی هەر هەموویانی لەبەرە. من لەو بڕوایەدام کە شڤان ڕاست ناکات. ئەو ناوانەی هەر لە خۆیەوە لە ئەستێرەکان ناوە. چونکە من جارێکیان لێم پرسی ناوی ئەو ئەستێرەیە چییە؟ شڤان پێی وتم ناوی "ئەستێرە گەورە جوانەکەیە."

ڕۆژی دوایی کاتێک لە قوتابخانەوە دەهاتینەوە بۆ ماڵەوە لە شڤانم پرسی هەمان ئەستیرە ناوی چییە، ئەو پێی وتم ناوی "تاجی پادشایە."
منیش بە شڤانم وت: "تۆ دوێنێ بە منت وت ناوی ئەستێرە گەورە جوانەکەیە، کەچی ئەمڕۆ دەڵێیت ناوی "تاجی پادشایە."
"ڕاستدەکەیت، بەڵام ئەمەیان ئەو ئەستیرەیەی دوێنێ نییە. دوێنی شەو ئەستیرە گەورە جوانەکە کشاوە و کەوتۆتە خوارەوە. تۆ دەبێت بڕوا بە من بکەیت. ئەم ئەستێرەیە ناوی تاجی پادشایە."
هەندێکجار بە گۆرانی وتن دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە "دەڕۆم بەناو دارستان و شاخ و داخدا." ئەگەر خەڵکی گوێی لێمان بێت، لەوانەیە وابزانێت کـە ئێمە جنۆکەین بە تاریکی گۆرانی دەڵێین. چونکە تاریکە و ئەوان ئێمە نابینن. لەبەرئەوە ئەوان نازانن کە ئێمە منداڵانی دێ بچکۆلین و بە تاریکیدا دەڕۆین و سەرانسەری ڕێگاکە گۆرانی دەڵێین.

# کاتێک ئێمە خۆمان گۆڕی

شەوێکی پایـز. باوک و دایکی هەموومان بانگ کرابوون بـۆ گەورەدێ بۆ ئاهەنگی ماڵی مامەشێخی عەتار. تەنها ئێمە لە ماڵەوە بووین لەگەڵ باپیرە و باجی توبادا.

من بە گڵۆپە دەستییەکەم ڕاسپاردەیەکم نارد بۆ هانا و هاوبەش. سێجار گڵۆپەکەم گوژاندەوە و دامگیرساند. ئەمەش بە مانای ئەوە بوو "هانا و هاوبەش خێرا وەرن بۆ لام. من ئیشێکی گرنگم پێتانە." زۆری پێنەچوو گوێم لە دەنگی تەپەی پێی هانا و هاوبەش بوو لە قادرمەکانمانەوە. من لە ڕاستیدا هیچی گرنگم نەبوو بۆ ئەوانی باسبکەم، من مەبەستم ئەوە بوو بەڵکو هەمووومان بەیەکەوە کاتێکی خۆش بەسەربەرین. هاوبەش بیرێکی باشی بۆ هات. ئەوەش ئەوە بوو کە ئێمە خۆمان بگۆڕین. بە جۆریک کە باجی توبا نەمانناسێتەوە. ئای خودایە چەند پەلەمان بوو.

لە هەورەبانەکەماندا جلی جۆراوجۆر و هەمە ڕەنگەی زۆری تێدا هەڵواسرابوو. کە هی باوکم و دایکم بوون.

هانا وتی من خۆم دەکەم بە پیاو و جلی پیاوانە لەبەردەکەم. هانا پانتۆڵە خەتخەتەکەی باوکمی لەگەڵ چاکەتە قاوەییەکەی لەبەرکرد و هەروەها کڵاوە ڕەشەکەی باوکمی کردە سەر.



دەرلینگی پانتۆڵەکە درێژ بوو هانا بـە دەرزی بەستی. قۆڵە درێژەکـانی چاکەتەکەی هەڵدایەوە.

بە تەپەدۆرێکی سووتاو سمێڵ و ریشی بۆ خۆی درووستکرد. هانا زۆر لە پیاوێکی گاڵتەجاری بچکۆلانە دەچـوو. من و هاوبەش ئەوەنـدە پێکەنین کە بە زەحمەت توانیمان تەنوورەکانمان لەبەربکـەین. من تەنورەیەکی ڕەشی دایکمم لەبەرکرد لەگەڵ بلووسێکی گوڵ گوڵی و پەچەیەکـی تەنکـم دۆزییەوە. کـاتێک پەچەکەم گـرت بە ڕوومەوە هانا و هاوبەش نەیان ناسـیمەوە. هاوبەشیش دەیویست پەچە بگرێت بە ڕوویەوە بەڵام ئێمە زۆر گەڕاین و پەچەمان بۆ نەدۆزرایەوە. لەبەرئەوە هاوبەش ڕەفتەیەکی بەست بە سەرییەوە، هەروەها ئەویش وەکو من فانیلەیەکی خوری و تەنورەیەکی درێژی لەبەردابوو.

شڤان و شادیش لەماڵەوە نەبوون ئەوان لای هەستیار بوون. کاتێک بە پێپلیکانەکاندا هاتینە خوارەوە باجی توبا نەیبینین. زۆر لە سەرخۆ بە هێواشی چووینە دەرەوە و لە دەرگای سەرەکی هاتینە بەردەرگای موبەقەکە. لە دەرگای موبەقەکەماندا، بەڵام تەقە لێدانێکی قایم.

باجی توبا هات وتی: "ئەوە کێیە؟ دەنگی باجی توبا ترسی بە تەواوەتی تێدا دیار بوو. سەرەتا نەمانزانی چیبڵێین بەڵام دوایی هانا وتی: "بێجێگە و ڕێگا میوانتانە."

"بۆتان نییە، چونکە خاوەن ماڵ لەماڵ نییە."

"دەمانەوێت بێینە ژوورەوە."

دەنگمان لێ بەرز کردەوە و کەوتینە کوتانی دەرگاکە. لە هەمان کاتدا خۆمان پێ ڕانەگیرا و دامانە پرمەی پێکەنین. من لە پێشدا لەسەرخۆ پێدەکەنیم، بەڵام لە ناوەوە دەکوڵام. وا هەستمکرد کە باجی توبا گوێی لە پێکەنینەکەم بوو بێت.

باجی توبا دەرگاکەی کردەوە و ئێمەش بەهەڵمان زانی خۆمان کرد بە ژووردا. باجی توبا بە گاڵتەوە پێی وتین:

"هەرگیز شتی وام نەبینیوە، چۆن کەسانی ئاقڵ و ژیری وەک ئێوە بەم شەوە درەنگە بۆ ماڵەوە دێنەوە."

هانا بە باجی توبای وت: "من ناوم قالەیە و ئەمانەش ژنەکانمن."

باجی توباش وتی: "وەڵاهی مامە قالە ژنەکانت زۆر جوانن. خەڵکی ژنێکـی دەست ناکەوێت کەچـی تۆ خاوەنی دوانیت. بۆم هەیە شەربەت بێنم بۆ ئەم خێزانە بەڕێزە؟"

ئێمەش شەربەتەکەمان خواردەوە و خۆمان وا نیشاندەدا کە مرۆڤی گەورەین و هەستمدەکرد کە گەورەبووم لەناو جلەکاندا.

دوایی بڕیارماندا بچین بۆ لای کوڕەکان و خۆمانیان نیشانبدەین.
دەرگاکەی ماڵی هەستیار دانەخرابوو. ئێمەش چووینە ژوورەوە.
کاتێک کە بە پێپلیکانەکاندا چووینە سەرەوە بۆ ژوورەکەی هەستیار، هاوبەش قیژەیەکی گەورەی کرد. کاتێک قاچی لە تەنورە درێژەکەی گیرا و هەڵخلیسکا. هەستیار دەرگاکەی کردەوە بزانێت چی ڕوویداوە. بڕوا بکەن هەستیار کە ئێمەی بینی ڕاچڵەکی. چونکە شوێنەکە تاریک بوو. هەستیار وایزانی بوو کە ئێمە سێ خێوین و لەسەر پێپلیکانەکان ڕاوەستاوین.
کاتێک شڤان ئێمەی بینی کە خۆمان گۆڕیوە. ئەویش بڕیاریدا خۆی بگۆڕێت. هەروەها شاد و هەستیاریش.
شڤان کراسێکی دایکی هەستیاری لەبەرکرد و پێڵاوێکی پاژنە بەرزی کردە پێی. شاد و هەستیاریش جلی پیاوانەیان لەبەرکرد.
شڤان دەخولایەوە بە دەور و بەریدا و باڵی لێدەتەقاند و بە دەنگێکی زیکنەوە دەیوت:
"ئۆی.. ئۆی.،، خوایە گیان حەزم لە یاپراخە. نازانم لەکوێ گەڵا مێوم دەستبکەوێت. ئەرێ ئێوە چۆن ئەو کولیچە خۆشانەتان درووست کردووە؟ دەتوانن فێرم بکەن منیش دروستی بکەم"
شڤان لاسایی ئافرەتی گەورەی دەکردەوە و وایدەزانی کە ئەوان بەو جۆرە قسە لەگەڵ یەکتری دەکەن.

دوایش چووین بۆ لای باپیره بۆمان گێڕایەوە کە ئێمە خۆمان گۆڕیوە. بەڵام باپیره بە داخەوە چاوی کز بوو هیچی نە دەبینی. ئێمە ماوەیەکی درێژ شانۆمان بۆ گێڕا. شانۆکە خۆمان دەرمانهێنابوو.

شڤان لەو شانۆیەدا ڕۆڵی ژنێکی توورەی دەبینی. ئۆی.. ئۆی...، کە زۆر پێکەنین. باپیرەش زۆر پێکەنی، هەرچەندە ئەو ئێمەی نەدەبینی ئەو هەر گوێی لێمان بوو.

# ئاو و هەوای ناخۆش

سەرەتای مانگی دیسەمبەر بوو. کە چووین بۆ قوتابخانە سەرانسەری ڕۆژەکە باران دەباری. شڤان پێی وتین:

"هەموو ڕۆژێک بێوچـان باران دەبارێت ئیتر ئەمساڵ بە چـاوی خۆمان بەفر نابینین لە جەژنی ڕەمەزاندا."

هەر جارێک کـە گوێم لە شڤان بوایە بیوتایە بەفـر نابارێت لـە جەژندا، ئەوا زۆر پێی زوویر دەبووم چونکە من بە زستان زۆر حەزم لە بەفر بوو.

کات تێدەپەڕی و تا دەبـوو جەژن نزیک دەبـووەوە بەڵام ئێمە تۆزقاڵێک هیوای ئەوەمان نەبوو کە تازە بەفر ببارێت. هەموومان لە پۆلەکەماندا دانیشتبووین و خەریکی ماتماتیک بووین، کاتێک شاد هاواری کرد: "سەیربکەن بەفر دەبارێت، چ بەفر بارینێک."

"ئەرێوەڵڵا بەفر دەبارێت."

هەموومان وەک گوڵ گەشاینەوە و لە خۆشیاندا دەمان قیژاند. مامۆستاکەمان پێی وتین با دەستی یەکتری بگرین و گۆرانی "ئەوا زستانە و بەفر دەبارێت" بڵێین.

کاتێک زەنگی لێدا و هاتینە دەرەوە، بەفرەکە بەقەدەر توێژاڵێک زەوی سپیکـردبوو. هەموومان لەسـەر بەفرەکە ژمارە پێنجێکـی

گەورەمان کێشا و گۆرانیمان دەوت و دەخولاینەوە بە دەوریدا.
"ئۆخەی وابەفر باریوە."
کە چی شڤان پێی وتین: "بەڵێ.. بەڵێ..، گۆرانی بڵێن. ئینجا ئەو تۆزە بەفرە چییە! بە خودا لەو تۆزە زیاتر هیچیتر ناباریێت!"
کە ڕۆژی دوایی چووینەوە بۆ قوتابخانە بە هەرحاڵ ئەوەندە بەفر باریبوو کە ئەرزەکە سپی ببوو. لە هەمانکاتیشدا بەفر هەر دەباری.
شڤان وتی:
"لەمە زیاتر چیتر بەفر ناباریێت و ناگاتە جەژن هەر بۆ خۆی دەتوێتەوە."
خوا کردی کە شڤان بە چاوی خۆی بینی کە گەیشتنە دەرگای قوتابخانەکەمان. بەفر تێیکرد بەڵام چ بەفر بارینێک. زۆری نەبرد، دیوی دەرەوەی پەنجەرەی پۆلەکەمان تەواو سپی بوو. نەتدەتوانی حەوشـەی دەرەوە ببینی. کلوکلو بەفـر دەباری و لەگەڵ بەفـر بارینەکەشدا ڕەشەبای لەگەڵدا بوو. بەفر دەباری و ڕەشەبا هەڵیدەکرد، ڕەشەبا هەڵیدەکرد و بەفر دەباری.
مامۆستا بە پەشۆکاویی و ترسەوە داوای لێکردین کە شەو لە لای ئەو بمێنینەوە. هەرچەندە ئێمە لە خوامان دەویست کە لای ئەو بمینینەوە. بەڵام ئێمە دەمانزانی ئەگەر نەچینەوە بۆ ماڵەوە، دایک و باوکمان مەراقی زۆریان بۆ دەخواردین.

ئێمە وتمان ناتوانین هەر دەبێت بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە. مامۆستا پێی وتین چاکتر وایە یەکسەر بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە پێش ئەوەی دنیا تاریک دابێت. کاتژمێر یەک بوو کاتێک بە ڕێگاوە بووین بەرەو ماڵەوە. بەفر بە بەردەوامی دەباری و ڕەشەباشی لەگەڵدا بوو. هانا بە تەشەرەوە بە شڤانی وت:

"شڤان! ئایا هیچ بەفر باریوە؟"

"شڤان وەڵامی هانای دایەوە:

"هێشتا جەژن نەهاتووە و لەوانەیە بەفرەکە زوو بتوێتەوە."

ڕۆیشتین.. و ڕۆیشتین.. و ڕۆیشتین..، هەموومان دەستی یەکتریمان گرتبوو بۆ ئەوەی لە یەکتری ون نەبین. بەفر تا سەر ئەژنۆمان هاتبوو، بە زەحمەت دەمانتوانی بە نێو بەفرەکەدا بڕۆین.



زۆر سارد بوو، لە سەرماندا پەنجەی دەست و پێمان تەزی بوو. ئەوەندە ماندوو بووم کە ئیتر نەمدەتوانی هەنگاو بنێم. بە شڤانم وت کە ناتوانم ئیتر بڕۆم و دەبێت تۆزێک پشوو بدەم. شڤان وتی شتی وا نییە. هاوبەشیش هیلاک بوو بۆیە ئەویش دەیویست تۆزێک پشوو بدات. شڤان بەویشی وت کە مەترسیدارە و نابێت کەس پشوو بدات. من و هاوبەش دەستمانکرد بە گریان و واماندەزانی ئیتر جارێکی دیکەماڵەوەمان نابینین. ئێمە ئەو کاتە نیوەی ڕێگاکەمان بڕی بوو. نزیکی دوکانی بەستەزمانی پینەچی بووین. لە هەموو شت چاکتر ئەوە بوو کە هەستیار پێی وتین:

"با بچین بۆلای بەستەزمانی پینەچی. بە هەرحاڵ لەم ڕۆژە تووشەدا بڕواناکەم گاز لە لوتی کەسمان بگرێت."

من و هاوبەش گرنگ نەبوو بە لامانەوە ئەگەر بەستەزمان گازیشی لە لوتی هەردووکمان بگرتایە.

بەستەزمان دڵخۆش نەبوو بە بینینمان. ئەو وەکو پیشەی نەڕاندی بەسەرماندا و دانی لێمان چیڕ دەکردەوە: "ئەرێ ئەمە ڕۆژی هاتنە دەرەوەیە. پێم ناڵێن ئێوە لەم ڕۆژە تووشەدا لە دەرەوە چی دەکەن. ئەمڕۆ ڕۆژی ئەوەیە کە خەڵکی بەدەرەوە بن؟"

نەماندەوێرا پێیبڵێین کاتێک کە ئێمە لە ماڵ دەرچووین ئاووهەوا وا ناخۆش نەبوو.

جله ئەستورەکانمان لەبەرداکەند و دانشتین و سەیری بەستەزمانمان دەکرد چۆن پێڵاوە دڕاوەکانی خەڵکی دەدورییەوە. بەستەزمان دەستیکرد بەنانە چـەورە خواردن و چاشـی لەگەڵدا دەخواردەوە. بەڵام ئەو بەشی کەسمانی نەدا. ئێمە هەموو برسیمان بوو بەڵام کەسمان نەماندەوێرا داوا لە بەستەزمان بکەین تۆزێک خواردنمان بداتێ. من بیرم لەو جارە دەکردەوە کە تەرزە زۆرەکە باری بوو. ڕامانکرد بۆماڵی باجی گوڵچین. باجی گوڵچین هەموو خواردنێکی خۆشی خستە بەردەستمان. ئەوە باجی گوڵچین بوو ئەمەش بەستەزمانە.

ئەوەندە بەفر بارِیبوو کە ئێمە نەماندەتوانی بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە. ئەی خودایە کە من بیری ماڵەوە و لادێکەمان و دایک و باوک و جێگەی نووستنەکەی خۆمم دەکرد.

لەپڕ گوێمان لە دەنگی بەفرلابەرەکەی ماڵی خۆمان بوو .کە لە



پەنجەرەکەوە ڕوانیم باوکمم بینی کە بەفرلابەرەکەمانی لێدەخوڕی. ئەو هاتبوو بەفری سەر ڕێگاکە بماڵێت. ئێمە دەرگاکەمان کردەوە و هاوارمانکرد و بەستەزمان،قیژاندی بە دواماندا:

"دەرگاکە دابخەن. با سەرما نەیەتە ژوورەوە."

باوکم کە ئێمەی بینی لە خۆشیدا وەک گوڵ گەشایەوە. بە دەنگی بەرز پێی وتین کە لە شوێنی خۆمان بین هەتا ئەو بەفری سەر ڕێگاکە دەماڵێت و دوایی دەگەڕێتەوە بە شوێنماندا.

کە باوکم گەڕایەوە ئێمەش سواری بەفرلادەرەکە بوین ڕێگاکە هیچ ترس و ناخۆشی تێدا نەمابوو. چونکە باوکم هەموو بەفرەکەی لەسەر جادەکە ماڵیبوو.

دایکم بە ترسەوە لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانی. کاتێک گەیشتینە ماڵەوە من و شڤان و شاد شۆربای گۆشتاومان خوارد. بڕوا بکەن گۆشتاوەکە خۆشترین خواردن بوو کە لە ژیانمدا خواردبێتم. سێ قاپم خوارد.

باوکم کاتێک بەفری سەر جادەکەی دەماڵی. ئەو دەیزانی کە ئێمە بە ڕێگاوەبووین بەرە و ماڵەوە. ئەگەر باوکم نەهاتایە دەبوایە بە بێ شێو لەلای بەستەزمانی پینەچی ڕۆژمان بکردایەتەوە.

دوای نانخواردن چوومە ناو جێگەکەم. یەکسەر لێی نووستم، بە ڕاستی زۆر خەوم دەهات.

# بەم زوانە دەبێت بە جەژن

ڕۆژی دوایی بە ڕێگاوە بووین بۆ قوتابخانە. خۆر بوو، لە هەموو لایەکی دارستانەکەوە تیشکی خۆر دەدرەوشایەوە و بەفری سەر دارەکان سپی و جوان بوون، دەبریسکایەوە.

کە گەیشتینە قوتابخانە مامۆستاکەمان پێی وتین، بە درێژایی شەوەکە، ئەو خەوی باش لێ نەکەوتووە، هەر بیری لای ئێمە بووە. ئاخۆ ئێمە بە سەلامەتی گەڕاوینەتەوە بۆ ماڵەوە.

لەبەرئەوەی کە ڕۆژی پێش جەژن بوو، مامۆستاکەمان چیروکێکی جەژنی بۆ گێڕاینەوە. هەستماندەکرد کە هەموو شتێک بە جۆرێکی تایبەت لە لامان سەیر و جوان بوو. ئەو کاتەی کە خەریکی خوا حافیزیکردن بووین لە مامۆستاکەمان، شتێکی خۆش ڕوویدا. مامۆستا کتێبی لە پایتەختەوە بۆ داوا کردبووین. لە هەمووی خۆشتر ئەوە بـوو ڕۆژێک پێش جـەژن، کتێبەکانمان لە پایتەختەوە بۆ هات.

ئێمە پێشتر سەیری لیستێکی کتیب فرۆشتنمان کرد، کە ناو و وێنەی بەرگی پەرتووکەکانی تێدا بوو. ئێمە ئەو کتێبانەمان دیاریکرد کە دەمانویست بیانکڕین. من دوو کتێبم دیاریکرد و شڤان و شادیش سەر و دوان. بە بەرگی کتێبەکانی منەوە وێنەیەکی کوڕە شازادە و کچە شازادەیەکی جوانی پێوە بوو.

مامۆستاکەمان یەک یەک ناوی خوێندینەوە و کتێبەکانی بە سەرماندا دابەشکرد. من بە زەحمەت ئۆقرەم لە سەر کورسییەکەم گرتبوو. چاوەڕوان بووم کەی کتێبەکانی خۆم وەربگرم. حەزمدەکرد کە کتێبەکان یەکسەر بخوێنمەوە بەڵام دایکم پێی وتبووین کە بۆمان نییە بیانخوێنینەوە، لە ئێوارەی بەرەجەژنا نەبێت.

پێش ئەوەی بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە هەموو گۆرانییەکانی جەژنمان وتەوە. خوا حافیزیمان لە مامۆستاکەمان کرد، ئەو بە هیوای ئەوە بوو کە جەژنێکی خۆش بەسەر بەرین. من خۆشم لەو بڕوایەدا بووم کە جەژنێکی خۆش بەسەر دەبەین.

من و هانا و هاوبەش ڕامانکرد بۆ دوکانی مامەشێخ. لەوێ کاغەزی بریقەداری سوور و زەرد و سپی و سەوز و شینمان کڕی بۆ ئەوەی ژوورەکەمانی پێبڕازێنینەوە.

کە چووینەوە بەرەو ماڵەوە دنیا ڕووناک و جوان بوو. هانا کتێبەکەی دەرهێناو بۆنی پێوەکرد. دوایش ئێمە یەک یەک بۆنمان بە کتێبەکانمانەوە کرد. کتێبی تازە بۆنی زۆر خۆشە هەر بە بۆنەکەیدا بۆت دەردەکەوێت خوێندنەوەکەی چەند خۆشە. دوایی هانا دەستیکرد بە خوێندنەوەی کتێبەکەی. دایکی هاناش بە هانا و هاوبەشی وتبوو کە دەبێت ئەوانیش کتێبەکان سەر لە ئێوارەی جەژن بخوێننەوە. هانا وتی ئەو تۆزێکی لێدەخوێنێتەوە تا ئەو دەمە.

که هانا تۆزێکی بۆ خوێندینەوە، من و هاوبەش وتمان چەند بەلەزەت و خۆشە. ئێمە تکامان لە هانا کرد تۆزێکیترمان لە کتێبەکە بۆ بخوێنێتەوە. تازە کار لە کار ترازا بوو. کە هانا تۆزێکی لێدەخوێندەوە، بەسەرهاتی کتێبەکە زیاتر لەلامان شیرینتر دەبوو. شڤان دەیوت:

"من دەبێت بزانم ئەو کچە شازادەیە جادووی لێکراوە یان نا."

هاناش ناچار بوو نەختێکی تریشی لێبخوێنێتەوە، بەم شێوەیە بەردەوام بووین. کە گەیشتینە دێکەی خۆمان هانا هەموو کتێبەکەی خوێندەوە. هانا وتی قەیناکات ئەو بە هەرحاڵ سەر لە ئێوارەی جەژن جارێکی تریش کتێبەکە دەخوێنێتەوە.

لە ماڵی خۆمان دایکم و باجی توبا خەریکی لێنانی چێشتی جەژن بوون. موبەقەکە کەوتبوو بەسەر یەکدا فەوزایەکی گەورەبوو. خێرا نانمان خوارد و چووینە دەرەوە.

شڤان و شاد و من چرایەکی بەفرینەمان درووستکرد لە ناو باخچەکەماندا. هانا و هاوبەش و هەستیاریش هاتن بۆ یارمەتیدانمان. چرا بەفرینەکە پێکهاتبوو لە دیوارێکی خڕ کە بە بەفر درووستکرابوو. لە هەموو ڕوویەکییەوە کۆمەڵێک پەنجەرەی بچووکمان تێدا درووستکرد بوو.

کۆمەڵێک باڵندە بە دارەکەمانەوە هەڵنیشتبوون. دیار بوو برسیان بوو. منیش ڕامکرد بۆ لای باوکم پێم وت با خواردنی باڵندەکان هەڵواسین بە دارەکانەوە. خێرا بە ڕاکردن چووین بۆ ژووری زەخیرە و پێنج کیسەی بچکۆلانەی جۆمان هێنا.



کە کاتی خۆی بۆ باڵندەکانمان دانا بوو. کیسەکانمان هەڵواسی بە دارەکانەوە و زۆری پێنەچوو، باڵندە برسییەکان دایانە شەقەی باڵ و فڕین بۆ لای کیسە جۆکان.



دەمەو ئێوارەکەی سەرماندا لـە باپیرە. لە لای ئەو خەریکـی درووستکردنی زەمیلەی بچکۆلانە بووین. کورەکانیش یارمەتیان دەدایـن. لـە پێشدا ئەوان نەیانویست یارمەتیمان بـدەن، دوای تاوێک ئەوانیش کەوتنە کۆمەک کردنمان. هەمووومان لە دەوری مێزە خڕەکەی باپیرە دانشتبووین.

پەنجا و چوار زەمیلەی بچکۆلانەمان دروستکرد کە بە یەکسانی بەشمان کرد لە نێو خۆماندا. هەر ماڵی هەژدە دانەی بەرکەوت. باپیرە دەعوەتی سێو و حەڵوای کردین.

هەموو ئەو کاتەی کە لای باپیرە بوین. من بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن ڕۆژی دواتر کێک و کولیچە درووست بکەین. کێک درووستکردن بەلامەوە وەکو ئێوارەی جەژن خۆش بوو.

لەمەدا بووین و لەپڕ شڤان دەرپەڕییە دەرەوە و مۆمی ناو چرا بەفرینەکەی داگیرساند. لـە پەنجەرە بچکۆلانەکانەوە شەوقـی مۆمەکە دەهاتە دەرەوە.

ئـۆی لەو شـەوە تاریکەدا، چـرا بەفرینەکە لەناو حەوشەکـەدا دەدرەوشـایەوە. من هەر لەویانەدا دەمبینی کـە چۆن جـەژن هەروەکو چرا بەفرینەکە جوانیمان بۆ دەهێنێت. یەکسەر بیرم لە گۆرانی جەژن کردەوە:

"وا جەژن هاتووە"

هاوبەش پێی وتین: "بەزەییم بەباپیرەدا دێتەوە کە بە جوانی چرا بەفرینەکە نابینێت. با گۆرانییەکی بۆ بڵێین چونکە باپیرە حەزی لە گۆرانییە."

ئێمەش گۆرانیمان بۆ وت هەر هەمان گۆرانی کە من پێشتر بیرم لێکردەبووەوە:

"وا جەژن هاتووە
لەبەر دالآنی بەفرا وەستاوە
خۆشی و شادی بۆمان هێناوە."

بە چپە هانا پێی وتم: "سارا، تۆ لەو بڕوایەدای کە جەژن پڕ بێت لە خۆشی؟"

منیش وتم: "ئا لەو بڕوایەدام."

هەموو منداڵانی لادێکەمان پێکەوە کاتێکی خۆشمان بەسەربرد، هەرچەندە وەکو تریش ژیانمان پـڕ بوو لەخۆشـی، لە هاوین و زستان و بەهار و پایزدا.

سوپاس بۆ خودا زۆر خۆش ڕادەبوێرین لە دێ بچکۆل.



ئەستريد ليندگرين لە ساڵی (١٩٠٧) لە دايک بووە.
لە تەمەنی (٩٤) ساڵیدا کۆچی دوايی کردووە.
(٨٨) شاکاری ئەدەبی بۆ منداڵان نووسيوە.
ڕۆمانەکانی بۆ (٧٦) زمان وەرگێردراون، زۆربەی
بەرهەمەکانی بە زۆر زمان کراون بە شانۆگەری و
فيلم و پرۆگرامی ڕاديۆ و تەلەفزيۆن.